خالید حەداد

# فەرهەنگی کارەساتە سروشتییەکان

## بۆ گشت تەمەنەکان






وەرگێرانی

**موحسین چینی**

# کارەساتە سروشتییەکان

بابەت : فەرهەنگ
نووسینی : خالید حەداد
وەرگێڕانی : موحسین چینی
کۆمپیوتەر : ئارام دلشاد
بەرگ‌و دیزاین : کارزان سعدی
چاپخانە : کۆمەڵگای چاپەمەنی شەهاب
نۆرەی چاپ : چاپی یەکەم
تیراژ : ١٠٠٠ دانە

لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارەی سپاردنی (٢٥٨٥) ی ساڵی (٢٠٠٩)ی دراوەتێ



نرخی (3000) دینارە

# پێشەکــــی

کارەساتە سروشتییەکان کارەساتی لە ناکاون، لـە هەنـدێ دیـاردەی سروشـتی روو دەدەن و دەبنە هۆی مردن و بریندار بوونی ژمارەیەکی زۆر لە خەڵك و زیـانێکی گـەورە لـە مـاڵ و سامان و باڵەخانە نیشتەنییەکان دەدەن و سەدان هەزار یا هەندێ جار بە ملیۆنـەها کـەس ناچار دەکەن کە واز لە خانووەکانی خۆیان بهێنن.



ئەم دیاردانە بوومەلەرزە و لەزینە زەوییـەکان دەگرێتـەوە و، دیـاردەی ((تـسونامی)) کـە ساڵی ٢٠٠٤ تووشی زۆربـەی وڵاتـانی باشـووری رۆژهـەڵاتی ئاسـیا بـوو و، بـووە مایـەی کوشتنی دەوروبەری ٣٠٠ هـەزار کـەس . هـەروەها کارەسـاتە سروشـتییەکان هەڵـچوونە گڕکانییـەکان، ئاوهەڵـسان، لافـاو و رەشـە بایـەکان بەهـەموو جۆرەکانیـەوە دەگرێتـەوە، هەروەها دارمانە زەوییەکان و ڕنییە سەهۆڵبەندەکان، ئاگرە گـەورەکان، شـەپۆلی گـەرمی نائاسایی، نەهات و برسییەتی و دەردیش دەگرێتەوە کە خەڵکی دنیا تووشیان بووە .

ئەم کتێبە جۆرەها دیاردە سروشتییەکان دەخاتە روو کە دەبنە هۆی ئەم کارەساتانە . هۆیە سەرەکییەکانیش دێنێتەوە کە دەبنە هۆی روودانیان، بەدرێژی باسی رووداوەکان دەکات و بەوێنە و بەژمارە گرنگترین رووداوەکان باس دەکات کە لە چەندین سەردەم لە مێژوودا بەتایبەتی لە ماوەی سەدەی بیستەم کە تووشی خەڵکی سەر زەوی بووەتەوە .



هەروەها کتێبەکە بەشێك بەتەنیا لە رووداوی نغرۆبوونی کەشتی تایتانیکی مێژوویی دەدوێت و، بەشێك لە سێگۆشەی بەرمۆدا، ئەو شتە نادیارەی چەندین کەس و فرۆکە و کەشتی سەری تێدا چووە و بەتەواویش تاکو ئیمرۆ نهێنییەکەی ئاشکرا نەکراوە سەرەرای ئەوەی زۆر لە لێکۆڵینەوە و بشکنینەوەشی لەسەر کراوە . ئومێدەوام لە خوێندنەوەی ئەم کتێبە سوودی تەواوی لێوەرگرن و، ئومێدەواریشم بەم شێوە غەمگینییەی نووسینەکانمان دارشتووە، پێی دڵتەنگ و غەمگین نەبنەوە .

## بوومەلەرزە و لەرزینەوە زەوییەکان

بوومەلەرزە ڕێکهاتنەوەیەکی توندی ڕووی زەوییە کە هەموو کەلێن و بۆشاییەکی نێوان خۆی پڕ دەکات یا دادەخات. هۆیەکەشی جوولانەوەیەکی خێرای توێکڵە بەردینە دەرەوەییەکەی خۆیەتی، بوومەلەرز لە کاتی دەرپەرینێکی لە ناکاوی وزە هەڵپەسێردراوی نێو ناخی زەوی روو دەدات، کە هەمیشە لە شێوەی پاڵەپەستۆی گرژبوونەوە یا لێکراکێشانەوە لە بەردەکان دەستپێدەکات و ئەو وزەیەش بەهۆی شەپۆلە لەرزینەوەکانەوە دەگاتە ڕووی زەوی.



بڕی زیان و تێکدانەکان بە قەوارە و ماوەی لە رزینەکان دەخەملێندرێت و هەروەها بەگوێرەی نزیکبوونیشی لە ناوچە ئاوەدانییەکان، بوومەلەرزەکان لە لەرزینەوە زۆر بچووکەکانەوە دەستپێدەکەن کە کەس هەستیان بێ ناکات تاکو ڕێکهاتنەوە مەزنەکان کە خەڵك لە دووایی هەزاران کیلۆمەترەوە هەستی پێ دەکەن .

لەرزینەوە زەوییەکان لەسەرجەم ناوچەکانی جیهان بەرێژەیەك روو دەدات دەگاتە سەدان جار لە هەر رۆژێکدا . روانگەکانی لەرزینەوە زەوییەکان هەموو ساڵێك دەوروبەری ملیۆن لەرزینەوەی بچووکی زەوی تۆمار دەکەن. بەڵام بوومەلەرزە گەورەکان کە دەبێتە هۆی زیانێکی گەورە لە گیان و ماڵەکان یەك جار لە ماوەی چەند ساتێك لە سەرجەم ناوچەکانی جیهان روو دەدات . لە رزینەوە زەوییەکانیش کە بەشێوەیەکی مام ناوەندی وزیانیان دەبێت دەوروبەری بیست کەرەت لە ساڵێکدا روو دەدەن .



لە ماوەی چەند سەدەیەکی کەمی رابردوو بوومەلەرزەکان بوونەتە هۆی کوشتنی ملیۆنەها کەس و، برێکی ئێجگار گەورەش لە زیانە ماددیەکان، ئێستا چەندین دەوڵەت هەندێ پێشینکارەی جۆربەجۆر دەکەن بۆ ئەوەی زەرەری لەرزینەوەکان لە گیانی و ماددی سووکبکەنەوە وەکو هۆشیارکردنەوەی خەڵك و، پلاندانان بۆ رووداوی لە ناکاو و، دروستکردن و دامەزراندنی بینای بەهێز بۆ ئەوەی پتر بەرگەی بوومەلەرزە بگرێت .

## پێوەری ریختەر

توانا و قەوارەی بوومەلەرزە بەپێوەرێك دەپێورێت پێی دەگوترێت پێوەری ریختەر، ئەمەش تشارلز ریختەری زانای بوومەلەرزەکانی ئەمەریکایی لە ساڵی ۱۹۳۵ دایهێنا، تاکو بوومەلەرزەکان پۆلین بکات کە لە ویلایەتی کالیفۆرنیا روویان دەدا ئینجا لە دوای ئەمە ریختەر و یاریدەدەرەکەی ئەم پێوەرەیان وا دەستکاری کرد تاکو بۆ هەموو بوومەلەرزەکان بشێت کە لە سەرجەم ناوچەکانی جیهان روو دەدەن .



پێوەری ریختەر بە دوورایی ۱۰۰ کم لە رووی چەقی بوومەلەرزەوە لەرزینەوەی زەوی دەپێوێت و، پلەکانی لە ۱ تاکو ۱۰ یە و هەر زیادەیەك لە هەر پلەیەك تێیدا دەکاتە بەرانبەر دەهێندە لە هێزی لەرزینەوەی زەوی بەمانای بوومەلەرزەیەك بەهێزی ۷ پلە هێزەکەی دەکاتە دەهێندەی بوومەلەرزەیەك کە بەهێزی ٦ پلە بێت .

بوومەلەرزەی پلە ٥ ی سەر پێوەری ریختەر لە رووی مەترسییەوە دەکرێ بە مام ناوەندی بژمێردرێت و لە زۆربەی جارەکان زیانی گەورەی گیانی و ماڵی نابێت مەگەر لە هەندێ حاڵەتی دەگمەن نەبێت، بوومە لەرزەی پلە ٦ لە کاریگەری خۆی گەورە دەبێت و لەوانەیە زیانێکی گەورەی گیانی و تێکدانێکی گەورەش لە ماڵ و سامان ئەنجام بدات و بوومەلەرزەی پلە ٧ یا پتر بە کارەساتە سروشتییەکان لە قەڵەم دەدرێن کە پاشماوەیەکی دڵتەزێنیان لە گیان و سامان بەدوادا دەمێنێتەوە .



سەرەرای ئەوەی کە پێوەری رێختەر هیچ سنوورێکی دیاریکراوی نیە، کەچی بوومەلەرزەیەك لە پلە ٨ و سەرەوە زۆر بە دەگمەن روو دەدەن و، هێزی پلە ٨ لە هێزی کاوڵکردندا دەکاتە سەدان هەزار کەرەت لە هێزی کاوڵکردنی بۆمبای ئەتۆمی کە ساڵی ١٩٤٥ هاوێژرایە سەر شاری هیرۆشیمای ژاپۆنی . زانایانیش بوومەلەرزەیەکی پلە ١٢ وا دەخەمڵێنن کە بتوانێت گۆی زەوی کەرت بکات و بیکاتە دووبەش .

لە سەدەی بیستەم ژمارەیەکی زۆر لە بوومەلەرزەکان روویانداوە کە سەدان هەزار کەسیان لە نێو بردووە و بوونەتە مایەی زیان و زەرەرێکی ئێجگار گەورەش . یەکەمینیان هەرێمی جامۆ و کەشمیری گرتەوە کە دەکەوێتە باکووری وڵاتی هیندستان و ئەمەش لە رۆژی ٤ی نیسانی ساڵی ١٩٠٥ رووی دا و هێزەکەی ٨,٣ پلەبوو لەسەر پێوەری ریختەر و بووە هۆی کوشتنی دەوروبەری بیست هەزار کەس و ماڵوێرانی و دەربەدەرکردنی دەیان هەزار و تێکدان و رووخاندنی هەزاران خانووبەرەش .



لە ١٨ی نیسان ساڵی ١٩٠٦ بوومەلەرزەیەك شاری سان فرانسیسکۆی ئەمەریکایی گرتەوە هێزەکەی ٨,٣ پلەبوو بەگوێرەی پێوەری ریختەر، بووە هۆی تەقاندنەوەی بۆرییەکانی ئاو و گاز و، ئاگرێکی هەڵگیرساند ماوەی سێ رۆژان بەردەوام بوو و لە ئەنجامدا پتر لە ٣٠٠٠ کەسی کوشت و ٢٨ هەزار خانوو و باڵەخانەی کاوڵ کرد و ئەم بوومەلەرزەیە بە بەهێزترین بوومەلەرزە دادەنرێت کە لە مێژووی ئەمەریکا رووی داوە .

لە تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٨٩ و، دوای تێپەڕبوونی ٨٣ ساڵ بەسەر بوومەلەرزەی ساڵی ١٩٠٦، هەمان ناوچەی شاری سان فرانسیسکۆ تووشی بوومەلەرزەیەکی توند بووەوە، هێزەکەی لەسەر پێوەری ریختەر ٧,١ بووە و بووەتە هۆی کوشتنی سەدان کەس و تێکدانی بەشێکی گەورە لە باڵەخانە بازرگانییەکان و باڵەخانە نیشتەجێبووەکانی خەڵکی لە نیوەندی شارەکە و هەروەها تێکدان و دارمانی یەکێك لە پردەکان و تێکدانی ڕێگا سەرەکییەکەی بۆ پردەکە دەچوو .




هەروەها وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا ساڵی ١٩٩٤ لە ناوچەی شاری لۆس ئەنجیلۆسی باشووریی ڕۆژئاوایی بوومەلەرزەیەکی دیکەی بەخۆیەوە بینی، تواناکەی ٦,٨ پلە بوو لەسەر پێوەری ڕێختەر و بووە هۆی تێکدان و دارمانی سێ ڕێگای سەرەکی و، بەملیارەها دۆلار زیان و، دەربەدەرکردنی هەزاران کەس دوای ڕووخان و داتەپینی خانووبەرەکانیان .

لە ماوەی سەدەی بیستەم وڵاتی شیلی کە کەوتووەتە سەر قەراغی رۆژئاوای ئەمەریکای باشوور تووشی سێ بوومەلەرزەی توند بووەوە . یەکەمینیان لە ١٦ ئابی ساڵی ١٩٠٦، بە توانای ٨,٦ پلە لەسەر پێوەری ریختەر و، لە ئەنجامدا نزیکەی ٢٠ هەزار کەسی کوشت و، دووەمینیان لە ٢٤ ی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٣٩ روویدا و، تواناکەی ٨,٣ پلە بوو بەپێوەری ریختەر و ئەویش نزیکەی ٣٠ هەزار کەسی کوشت .



بەڵام سێیەمین بوومەلەرزە کە لە رۆژی ٢٢ ی ئایاری ساڵی ١٩٦٠ روویدا بە توانای ٨,٣ پلە لەسەر پێوەری ریختەر و، نزیکەی ٢٠ هەزار کەسی کوشت و، بوومەلەرزەکە شاری کۆنسبسیۆنی شیلی بەشێوەیەکی نیمچە تەواو شارەکەی لە بن و بۆتکەوە تەخت و وێرانی کرد، هەر لە ئەنجامی ئەم بوومەلەرزەیە شەپۆلەکانی تسۆنامی بەرز بوونەوە و گەیشتنە ئەوبەری ئۆقیانووسی هێمن و لە ئەنجامدا چەند سەد کەسانێکی لە دورگەکانی هاوای و ژاپۆندا کوشت .

لە ٢٨ی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٠٨ شاری موسەینا کە دەکەوێتە باکووری ڕۆژهەڵاتی دورگەی سقلیەی ئیتالیایی و شاری ڕیجو دی کالابریا کە لە هەرە باشووری ئیتالیایە و ئەم دووشارە نۆکەندێکی بچووکیان لە نێواندایە، هەردوو شار تووشی بووەلەرزەیەك بوونەوە بە توانای ٧,٥ پلە لەسەر پێوەری ڕیختەر هەردوو شاری نزیکەی بە تەواوەتی لە نێو برد و، لە دوای بوومەلەرزەکەش شەپۆلی زۆر گەورە لە دەریا پەیدا بوون و شاری ڕیجۆدی کالابریان بە تەواوی نغرۆی ژێر ئاو کرد .




لە ژمارەی قوربانیانی ئەم بوومەلەرزەیە سەرچاوە زۆرن، هەندێکیان دەڵێن ژمارەی گەیشتە ٧٥ هەزار کەس و، لەسەرچاوەی دیکەدا هاتووە کە ژمارەی قوربانییەکان لە ٢٠٠ هەزار کەس تێپەڕیوە، کەچی هەندێ سەرچاوەی دیکە لە ١٠٠ هەزار کەس تێناپەڕێنێت، کوژراو و بریندار بووەکان زۆربەیان خەڵکی ئەم دوو شارە بوون و بەهەرحاڵ لە مێژووی ئەورووپا ئەمە بە ناخۆشترین کارەسات و خراپترین بوومە لەرزە لە قەڵەم دەدەن.

لە ماوەی سەدەی بیستەم بەشی وڵاتی چین لە بوومەلەرزە تێکدەرەکان زۆر لە بەشی وڵاتەکانی دیکە زیاتر بووە . لە ١٦ کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٢٠ ناوچەی غانسۆ کە کەوتووەتە باکووری چین، بوومەلەرزەیەکی بەهێز لێیدا، تواناکەی گەیشتە ٨,٦ پلە لە پێوەری ریختەر ئەمەش بووە هۆی کوشتنی پتر لە ٢٠٠ هەزار کەس و ملیۆنەها کەسی دیکەشی لە ماڵ و حاڵی خۆیان دەربەدەر و بێ سەرو شوێن کرد .



هەر لە کۆتایی ئەوساڵێدا ١٩٢٠ و، سەرەتای ساڵی ١٩٢١ ناوچەکانی باکووری چین تووشی بارودۆخی وشکایی بووە و بووەتە مایەی نانەوەی سەری نیو ملیۆن کەس، ئینجا لە ٢٢ ی ئەیاری ساڵی ١٩٢٧ بوومەلەرزەیەکی دیکەی تێکدەر هەمان ناوچەی غانسۆی گرتەوە، تواناکە ٨,٣ پلە بووە و، پتر لە ٢٠٠ هەزار سەری دیکەی هاوڵاتیانی تێچوواند...

ئەم کارەساتانە ماینەوە و مکوڕ بوون کە بە دوای وڵاتی چین بکەون ئەویش وەکو دەست بەستراوێك لە بەرانبەریدا بووەستێت و هیچی پێنەکرێت . لە ٢٦ی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٣٢ بوومەلەرزەیەکی نوێ هەمان هەرێمی غانسۆی چینی گرتەوە، ئەمجارە بوومەلەرزەکە بە توانای ٧,٦ پلەی سەر پێوەری ریختەر بوو و، بووە هۆی کوشتنی دەوروبەری ٧٠ هەزار کەس و، تێکدان و دارمانی دەیان هەزار خانووبەرە، سەرەڕای ئەمەش ملیۆنەها خەڵکی دیکەی لە ماڵ بەدەرنا و دەربەدەری کردن .



لە ٥ ی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٧٠ بوومەلەرزەیەکی نوێ لە هەرێمی یۆنانی وڵاتی چینی بە توانای ٧,٧ پلەی سەر پێوەری ریختەر رووی دا، دەوروبەری ١٦ هەزار کەسی کوشت ئینجا لە ٢٨ی تەمووزی ساڵی ١٩٧٦ بوومەلەرزەیەکی دیکە هەرێمی تانغشانی چینی گرتەوە و، توانای ٨ پلە بوو دەوروبەری ٢٥٥ هەزار کەسی لە نێوبرد .

لەگەڵ هاتنی سەدەی بیست و یەکەم وڵاتی چین لە ٢٦ ی کانوونی یەکەمی ساڵی ٢٠٠٦ بوومەلەرزەیەکی دیکەی بەخۆوە بینی . بنکەکەی لە ناوچەی هانغشۆنی باشووری رۆژئاوای دورگەی تایوان بوو . تواناکەی گەیشتە ٦,٧ پلە و روودانی لەگەڵ دووەمین یادی ساڵانەی شەپۆلەکانی تسۆنامی رێککەوت کە ساڵی ٢٠٠٤ باشووری رۆژهەڵاتی ئاسیای گرتەوە و بووە هۆی کوشتنی پتر لە ٣٠٠ هەزار کەس .



کاریگەری ئەم بوومەلەرزەیە گەیشتە قەراغەکانی رۆژهەڵاتی چین و هەروەها هۆنگ کۆنگ و کۆریا و ژاپۆن و فلیپینیشی گرتەوە . ئەم بوومەلەرزەیە زیانی زۆری لە گیانی هاوڵاتیان نەدا و بەڵام زیانی گەورەی لە ماڵ و سامان دا زۆر لە کێبڵی پێوەندییە دەریاییەکانی لە کارخست کە چینی بە وڵاتانی دیکەی جیهان دەبەستەوە .

سەرەرای بوومەلەرزەی ساڵی ١٩٠٥ وڵاتی هیند لە سەدەی بیستەم چەندین بوومەلەرزەی دیکەی بەخۆوە بینی . لە ساڵی ١٩٣٤ یش بوومەلەرزەیەك بە توانای ٨,٣ پلەی سەر پێوەری ریختەر هەرێمی بیهاری لە باکووری رۆژهەڵاتی هیندستان گرتەوە و بووە هۆی کوشتنی نێوان ١١ هەزار و ٣٠ هەزار کەس . لە ٣٠ ئەیاری ساڵی ١٩٣٥ هەرێمی بلوشستان کە ئێستا کەوتووەتە رۆژهەڵاتی پاکستان .



هێزی بوومەلەرزەکە لەسەر پێوەری ریختەر گەیشتە ٧,٧ پلە ، هەندێ لە سەرچاوەکان گوتیان کە بووە هۆی کوشتنی ٣٠ هەزار کەس . کەچی هەندێ سەرچاوەی دی ئەم ژمارەیەی بۆ ٦٠ هەزار کەس بەرزکردەوە ، بە هەر حاڵ بوومەلەرزەی ساڵی ١٩٣٥ بە توندترین بوومەلەرزە ناسراوەکان دادەنرێت کە ناوچەکانی باشووری ئاسیای گرتووەتەوە .

لە ٢٩ی ئەیلوولی ١٩٩٣ هەرێمی مەهاراسترا لە ناوەراستی هیندستان تووشی بوومەلەرزەیەك بووەوە هێزەکەی ٦,٣ پلە بوو بەگوێرەی پێوەری ریختەر، بوومەلەرزەکە ١٥ هەزار کەسی کوشت و ١٦ هەزار کەسی دیکەشی بریندار و پەککەوتە کرد، زۆربەی خانووەکانی شاری خیلاری کە لە ناوچەکەدا بوون رووخان و لەگەڵ زەوی تەخت بوون، لە ٢٦ی کانوونی دووەمی ساڵی ٢٠٠١ بوومەلەرزەیەك هەرێمی غوجاراتی کرتەوە کە کەوتووەتە رۆژئاوای هیندستان. بوومەلەرزەکەش بەهێزی ٧,٧ پلە بوو بەگوێرەی پێوەری ریختەر.



هۆکاری ئەم بوومەلەرزەیە گەیشتە وڵاتی پاکستانی دراوسێ و، لە هیندستان و پاکستان نزیکەی ٢٠ هەزار کەسی کوشت و، لە ٨ی تشرینی یەکەمی ٢٠٠٥ بوومەلەرزەیەك بەهێزی ٧,٦ پلە لەسەر پێوەری ریختەر لە هەرێمی کەشمیری دا، کە کەوتووەتە باکووری هیندستان و باکووری رۆژهەڵاتی پاکستان و لە هەردوو وڵاتدا دەورووبەری ٨٧ هەزار کەسی کوشت.

ژاپۆن لە ماوەی سەدەی بیستەم تووشی دوو بوومەلەرزەی بەهێز بووەوە. یەکەمینیان لە ١ ی ئەیلوولی ساڵی ١٩٢٣ رووی دا و، شاری تۆکیۆی پایتەختی ژاپۆنی تووشی زیانێکی زۆر گەورە کردەوە و هەروەها شاری یۆکۆهامای دراوسێ خۆی گرتەوە و ئەویشی بەتەواوەتی وێران و کاوڵ کرد . هێزی بوومەلەرزەکە گەیشتە ٨,٣ پلە و هەر لە دوای ئەمەش ئاگرێکی گەورە لە ناوچەکە هەڵگیرسا و لە ئەنجامدا پتر لە ١٤٠ هەزار کەسی لە نێوبرد.



بەڵام بوومەلەرزە گەورەکەی دووەم لە ١٧ی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٥٥ رووی دا. هێزەکەی گەیشتە ٧,٢ پلە و ٣٠ هەزار خانووی گەورە و بچووك و باڵەخانەی تێکدا و چەندین پردی لە شاری کۆبی کە کەوتووەتە باشووری رۆژئاوای پایتەخت رووخاند و پارچە پارچەیانی کرد و ئینجا بەدرێژایی شارەکە ئاگرێکی گەورەی هەڵگیرساند و ئەمەش بووە هۆی کوشتنی ٦٥٠٠ کەس و ٣٠ هەزار کەسیش بریندار بوون.

هەروەها تورکیاش لە ماوەی سەدەی بیستەم تووشی چەندین بوومەلەرزە بووەتەوە بەڵام لە هێزیدا جیاواز بووە و لەو زیانەی گیانی و ماددیشدا کە تووشی شارەکان بووە دیسان جیاواز بووە، لەمانە توندترینیان دوو بوومەلەرزەی بەهێزبووە یەکەمینیان لە ٢٦ی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٣٩ رووی دا و، هێزەکەی گەیشتە ٨ پلەی سەر پێوەری ریختەر و، شاری ئەزنکانی کە کەوتووەتە باکووری رۆژهەڵاتی وڵات بەتەواوی تێکدا و کاولی کرد و دەوروبەری ٣٠ هەزار کەسی کوشت.



دووەمین بوومەلەرزە لە ئابی ساڵی ١٩٩٩ رووی دا و شاری ئەزمیت و ناوچەی دەوروبەری گرتەوە کە دەکەوێتە باکووری رۆژئاوای وڵات و هێندەی ١٠٠ کم لە باشووری رۆژهەڵاتی ئیستانبۆڵ دوورە . هێزی بوومەلەرزەکە ٧,٤ پلەی سەر پێوەری ریختەر بوو و بووە هۆی تێکدان و کاولکردنی نزیکەی ٧٦ هەزار خانوو و باڵەخانەی نێو شاری ئەزمیت بەتەنیا و هەروەها دەوروبەری ١٧ هەزار کەسیشی کوشت .

لە هەردوو ساڵانی ١٩٤٨ و ١٩٤٩ ناوچەی ئاسیای ناوەڕاست تووشی دوو بوومەلەرزەی بەهێز بووەوە و، سەدان هەزار کەسی تووشی ماڵ وێرانی کرد و چەندین ناوچەی بەتەواوەتی تەخت کرد و ملیۆنەها کەسی دیکەشی ئاوارە کرد . یەکەمین بوومەلەرزە لە ٦ی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٤٨ رووی دا و ولاتی تورکمانستانی گرتەوە کە دەکەوێتە باکووری رۆژهەلاتی ئێران و ئەو کاتە یەکێك لە ولاتەکانی یەکێتی سۆفیەت بوو . بوومەلەرزەکە چەندین شاری کاوڵ کرد و لەمانەش عیشق ئابادی پایتەخت .



هێزی بوومەلەرزەکە گەیشتە ٧,٣ پلە. بووە هۆی کوشتنی نزیکەی ١١٠ هەزار کەس، لە ساڵی ١٩٤٩-ش بوومەلەرزەیەکی دیکە ولاتی تاجیکستانی گرتەوە، باکووری رۆژهەلاتی ئەفغانسان، ئەو کاتە یەکێك لە ولاتەکانی یەکێتی سۆفیەت بوو . هێزەکەی گەیشتە ٧,٥ پلەی سەر پیوەری ریختەر و نزیکەی ١٢٠ هەزار کەسی کوشت.

لە نێوان ٢٩ی شوبات و ١ی ئاداری ساڵی ١٩٦٠ زنجیرە بوومەلەرزەیەك شاری ئەغادیری مەغریبی گرتەوە، کە دەکەوێتە قەراغی باشووری رۆژئاوای وڵات و بەسەر ئۆقیانووسی ئەتلەسیدا دەروانێت . هێزی هەرە توندی بوومەلەرزەکان گەیشتە ٥،٨ پلەی سەر پێوەری ریختەر و بووە مایەی تێکدان و کاولکردنی نزیکەی ٧٠ ٪ ی خانووەکانی شارەکە بە هەزاران کەسی زیندوو و مردووی خستە ژێر دارو پەردوی باڵەخانە دارماوەکان .



دوا بە دوای ئەم بوومەلەرزانە شەپۆلی بەرز لە ئۆقیانووسی ئەتلەسی شارەکەی نغرۆ کرد و ئینجا ئاگرێکی ئێجگار گەورە هەڵگیرسا هەموو ناوچەکانی ئەغادیری گرتەوە، ئیتر بۆ ئەوەی قەوارەی زیانەکان کەم بکرێتەوە شارەکە لە خەڵکەکە چۆڵکرا، کەچی تەنیا پیاوانی پۆلیس و سوپا و تیپەکانی فریاکەوتن تێیدا مانەوە، لە ئەنجامی ئەمەش نزیکەی ١٥ هەزار کەس کوژرا کەسێیەکی دانیشتوانی شارەکەیان پێکدێنا.

هەندێ وڵاتانی ئەمەریکای لاتینی لە ماوەی سێیەکی دوایی لە سەدەی بیستەم تووشی ژمارەیەك لە بوومەلەرزە توندەکان بوونەوە . لە ٣١ی ئایاری ساڵی ١٩٧٠ پیرۆ، کە کەوتووەتە رۆژئاوای ئەمەریکای باشوور . بوومەلەرزەیەکی توند گرتییەوە، هێزەکەی گەیشتە ٧,٧ پلەی سەر پێوەری ریختەر و بووە هۆی دارمانی چیای واسکرانی باکووری پایتەخت و چیایەکەش لەگەڵ رمانی خۆیدا ١٠ گوندی نزیك خۆی تەخت کرد و لەگەڵ ئەمانەش شارۆچکەی شیمبۆتی -شی کاوڵ و وێران کرد و خەڵکەکەی بەگشتی خستەژێر داروپەردو و بەفرەکەی خۆی .



دارمانەکە بە تەنیا نزیکەی ٢٠ هەزار کەسی کوشت و، بوومەلەرزەکەش دەوروبەری ٧٠ هەزار کەسی لە پیرۆ کوشت . لە ٤ی شوباتی ساڵی ١٩٧٦ بوومەلەرزەیەك وڵاتی گواتیمالای گرتەوە کە دەکەوێتە ناوەراستی ئەمەریکای ناوەراست و، هێزی گەیشتە ٧,٥ پلە و دەوروبەری ٢٣ هەزار کەسی کوشت.

لە ماوەی دەکەوێتە نێوان ١٩ و ٢١ ی ئەیلوولی ساڵی ١٩٨٥ وڵاتی مەکسیك کە دەکەوێتە باشووری ئەمەریکای باکوور و باشووری وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا تووشی بوومەلەرزەیەك بووەوە هێزی گەیشتە ٨,١ پلە لەسەر پێوەری ریختەر . بوومەلەرزەکە مەکسیکۆی پایتەخت و سێ هەرێمی کناری گرتەوە و دەوروبەری ٢٥ هەزار کەسی لە نێو برد و لە لایەکی دیکە راپۆرتە رەسمییەکان ژمارەی کوژراوەکانیان تەنیا بە ٩٥٠٠ کەس بڵاوکردەوە .



پێشتریش وڵاتی ئەکوادۆر کە دەکەوێتە رۆژئاوای ئەمەریکای باشوور و باکووری وڵاتی پیرۆ. لە ٥ی ئابی ساڵی ١٩٤٩ بوومەلەرزەیەك گرتییەوە، هێزی گەیشتە ٦,٨ پلە لەسەر پێوەری ریختەر و بووە هۆی کوشتنی ٦ هەزار کەس و ماڵوێرانکردن و دەربەدەر کردنی نزیکەی ١٠٠ هەزار کەسی دیکەش.

وڵاتی ئێران بەوە ناسراوە کە لە هەموو جیهاندا زۆربەی بوومەلەرزەکان لەوێ روو دەدەن . لە ماوەی سەدەی بیستەم و سەرەتاکانی سەدەی بیست و یەکەم تووشی چەندین بوومەلەرزەی توانا هەمەجۆر بووەتەوە . لە ١ و ٢ ی ئەیلوولی ساڵی ١٩٦٠ تووشی بوومەلەرزەیەك بووەوە هێزی گەیشتە ٧,١ پلە لەسەر پێوەری ریختەر و ناوچەکانی باکووری رۆژئاوای گرتەوە و پتر لە ١٢ هەزار کەسی کوشت و دەیان هەزار کەسی دیکەشی پەرگەندە و دەربەدەر کرد.



لە ٣١ ی ئابی ١٩٦٨ بوومەلەرزەیەك باکوور رۆژهەڵاتی ئێرانی گرتەوە بەهێزی ٧,٤ پلە و بووە هۆی کوشتنی ١١٦٠٠ کەس و، لە ١٦ای ئەیلوولی ساڵی ١٩٧٨ بوومەلەرزەیەکی دیکە بەهێزی ٧,٧ پلە باکووری رۆژهەڵاتی ئێرانی گرتەوە و دەوروبەری ٢٥ هەزار کەسی کوشت.

لە هەردوو رۆژی ۲۱ و ۲٤ ی حوزەیران لە ساڵی ۱۹۹۰ دوو بوومەلەرزەی یەك لە دوای یەکدی لە ناوچە شاخاوییەکانی باکووری رۆژهەڵاتی ئێران رووی دا، هەریەکەیان هێزی ۷,۷ پلەی سەر پێوەری ریختەر دەبوو و، نزیکەی ٦۰ هەزار کەسی کوشت و بووە هۆی بریندار بوونی نزیکەی ۲۰۰ هەزار کەسی دیکەش و، سەدان هەزار خانوو و باڵەخانەی تێکدا، لە ئاکامدا ٥۰۰ هەزار کەسی دیکەش بێ داڵدە مانەوە.



لە ۲٦ی کانوونی یەکەمی ساڵی ۲۰۰۳ بوومەلەرزەیەك ناوچەی شاری (بام)ی شوێنەواری گرتەوە کە دەکەوێتە باشووری رۆژهەڵاتی ئێران، هێزی گەیشتە ٦,٦ پلەی سەر پێوەری ریختەر لایەکی گەورەی لە شارەکە دارماند و، نێوان ۳۰ و ٤۰ هەزار کەسی کوشت و، ۳۰ هەزار کەسی بریندار کرد و، دەوروبەری ۷٥هەزار کەسی دیکەشی بەبێ ماڵ هێشتەوە.

هەروەها ئەرمینیاش لەو وڵاتانە دادەنرێت کـە بەشـێوەی دووبـارەکی تووشـی بوومەلـەرزە دەبێتەوە، توندترین ئەم بوومەلەرزانە لە ٧ی کـانوونی یەکـەمی سـاڵی ١٩٨٨ رووی دا و، هێزی گەیشتە ٦,٩ ی پێوەری ریختەر و، ئەم بوومەلەرزەیە دەوروبـەری ٢٥ هـەزار کەسـی کوشت و، ١٥ هەزار کەسی بریندار کرد و، پتر لە ٤٠٠ هەزار کەسیشی لە مـاڵی خۆیـان دەربەدەر کرد.



لە ٢٦ی ئایاری ٢٠٠٦ بوومەلەرزەیەك بەهێزی ٦,٣ پلە لەسەر پێوەری ریختەر لە دورگەی جاوەی ئەندەنووسیای دا و، ٦٠٠٠ کەسی کوشت و ١٢٧ هەزار کەسی دیکەشی لـە مـاڵی خۆیـان ئـاوارە کـرد . لـە دوو لاپـەڕەی داهـاتوو خـشتەیەك دروسـت کـراوە گـرنگترین بوومەلەرزەکانی تێدایە کە لە ماوەی سەدەی بیستەم و سـەرەتای سـەدەی بیـست و یەکـەم روویان داوە .

| بەروار | شوێن | هێزی ڕێختەر | ژمارەی مردووان |
|---|---|---|---|
| ١٩٠٥ | هیندستان | ٨,٦ | ٢٠ هەزار |
| ١٩٠٦ | ولاتە یەکگرتووەکان | ٨,٣ | ٣٠٠٠ |
| ١٩٠٦ | شیلی | ٨,٦ | ٢٠ هەزار |
| ١٩٠٨ | ئیتالیا، مسینا | ٧,٥ | ٧٥ / ٢٠٠ هەزار |
| ١٩٢٠ | چین | ٨,٦ | ٢٠٠ هەزار |
| ١٩٢٣ | ژاپۆن | ٨,٣ | ١٤٠ هەزار |
| ١٩٢٧ | چین | ٨,٣ | ٢٠٠ هەزار |
| ١٩٣٢ | چین | ٧,٦ | ٧٠ هەزار |
| ١٩٣٤ | هیندستان | ٨,٣ | ١١ / ٣٠ هەزار |
| ١٩٣٥ | هیندستان | ٧,٧ | ٣٠ / ٦٠ هەزار |
| ١٩٣٩ | شیلی | ٨,٣ | ٣٠ هەزار |
| ١٩٣٩ | تورکیا | ٨ | ٣٠ هەزار |
| ١٩٤٨ | تورکمانستان | ٧,٣ | ١٠٠ هەزار |
| ١٩٤٩ | تاجیکستان | ٧,٥ | ١٢٠ هەزار |
| ١٩٤٩ | ئەکوادۆر | ٦,٨ | ٦٠٠٠ |
| ١٩٦٠ | شیلی | ٨,٣ | ٢٠ هەزار |
| ١٩٦٠ | مەغریب، ئەغادیر | ٥,٨ | ١٥ هەزار |
| ١٩٦٢ | ئێران | ٧,١ | ١٢ هەزار |
| ١٩٦٨ | ئێران | ٧,٤ | ١١٦٠٠ |
| ١٩٧٨ | ئێران | ٧,٧ | ٢٥ هەزار |

| بەروار | شوێن | هێزی ڕێختەر | ژمارەی مردووان |
|---|---|---|---|
| ١٩٧٠ | چین | ٧,٧ | ١٦ هەزار |
| ١٩٧٠ | پیرۆ | ٧,٧ | ٧٠ هەزار |
| ١٩٧٦ | چین | ٨ | ٢٥٥ هەزار |
| ١٩٧٦ | گواتیمالا | ٧,٥ | ٢٣ هەزار |
| ١٩٧٨ | ئیران | ٧,٧ | ٢٥ هەزار |
| ١٩٨٠ | ئیتالیا | ٧,٢ | ٢٩١٤ |
| ١٩٨٥ | مەکسیك | ٨,١ | ٢٥/٩٥٠٠ هەزار |
| ١٩٨٨ | ئەرمینیا | ٦,٩ | ٢٥ هەزار |
| ١٩٩٠ | ئیران | ٧,٧ | ٦٠ هەزار |
| ١٩٩٣ | هیندستان | ٦,٣ | ١٥ هەزار |
| ١٩٩٥ | ژاپۆن، کۆبی | ٧,٢ | ٦٥٠٠ |
| ١٩٩٥ | روسیا | ٧,٥ | ٢١٠٠ |
| ١٩٩٨ | ئەفغانستان | ٦,١ | ٤٠٠٠ |
| ١٩٩٨ | ئەفغانستان | ٧,١ | ٥٠٠٠ |
| ١٩٩٩ | تورکیا، ئەزمت | ٧,٤ | ١٧ هەزار |
| ١٩٩٩ | تایوان | ٧,٦ | ٢٤٠٠ |
| ٢٠٠١ | هیندستان | ٧,٧ | ٢٠ هەزار |
| ٢٠٠٣ | ئیران | ٦,٦ | ٣٠ / ٤٠ هەزار |
| ٢٠٠٥ | پاکستان - | ٧,٦ | ٨٧ هەزار |
| ٢٠٠٦ | ئەندەنووسیا | ٦,٣ | ٦٠٠٠ |

## تسۆنامی - شە پۆڵە بوومەلەرزەییەکان

تسۆنامی وشەیەکی ژاپۆنییە و زانستییانە بۆ مەبەستی شەپۆڵە دەریاییە بوومەلەرزەییەکان بەکاردێت . ئەم شەپۆلانەش لە ژێر رووی دەریا پەیدا دەبن و زۆرجار لە ئەنجامی بوومەلەرزەوە روو دەدەن و هەندێ جاریش لە ئەنجامی دارمان یا تەقینەوە گرکانییەکانەوە پەیدا دەبن و کاتێ پانتایی ئاستی رووی ژێرەوەی دەریا بەلایەکدا دەگۆڕێت زنجیرەیەك لە شەپۆڵەکان لە شێوەی قەوارەیەك هەڵبدەیتە نێو ئاوەوە پەیدا دەبێت .



شەپۆڵەکانی تسۆنامی درێژی هەمە جۆریان هەیە و لەوانەیە بەسەدان کیلۆمەتر درێژ ببێتەوە و، بەخێراییەك دەگاتە ۸۰۰ کیلۆمەتر لە کاتژمێرێکدا و کاتێ دەگاتە ئاوی تەنکایی نزیك قەراغەکان ئاوەکە زۆر گەورە دەبێ و بەرزاییەکەی لە نێو دەریا لە نیو مەتر دەستپێدەکات و لە ١٥ مەتری سەر قەراغ کۆتایی دێت و هەندێ جاریش بۆ ٣٠ مەتر بەرز دەبێتەوە .

بەرینی شەپۆلەکانی تسۆنامی دەگاتە دەوروبەری ۱۰۰ کم و، لەوانەیە هەندێ جار لە ۲۰۰ کیلۆمەتریش تێپەڕێنێت، کاتێ ئەم شەپۆلانە دەگەنە قەراغ لەبەر ئەوەی قەوارەیەکی ئێجگار زۆر لە ئاو پەیدا دەبێت، لە ئەنجامدا دەبێتە هێزێکی تێکدەر و کاولکەری زۆر گەورە، لەوانەیە هەموو قەراغەکە بخاتە ژێر ئاوەوە و هەموو شێوەکانی ژیانی مرۆڤ و گیانەوەر و ڕووەکەکان لە نێو ببات، هەروەها هەموو دامودەزگە شارستانییەکانیش بەتەواوەتی بکاتە داروپەردو .



پێویستە شەپۆلەکانی تسۆنامی کە لە بوومەلەرزە و داتەپین و بوومەلەرزەکانی ژێر قووڵایی دەریا پەیدا دەبن لەگەڵ ئەو شەپۆلانەی لە ڕەشە باو گەردەلوولە توندە دەریاییەکان ڕوو دەدەن تێکەڵاو بە یەکدییان نەکەینەوە، کە لە کاتی دەگاتە قەراغەکان دەبێتە هۆی ڕوودانی هەڵسانی ئاو و لافاوەکان و ئەو کاتەش ئەم جۆرە ڕەشە باو گەردەلوولانە ناوی لێدەنرێت شەپۆلە ڕەشەباییە دەریاییەکان .

یەكێك لە گەورەترین كارەساتەكانی تسۆنامی لە سەردەمی نویَ لە بەیانی رۆژی ٢٦ی كانوونی یەكەمی ساڵی ٢٠٠٤ رووی دا، كاتیَ بوومەلەرزەیەكی ئێجگار گەورە لە دووری ١٦٠ كم لە قەرغی سۆمەترەی ئەندەنووسیایی ژێرەوەی زەریای هیندی هەژاندەوە، یەكەمین جار بەهێزی ٩ پلەی سەر پێوەری ریختەر بوو، ئێنجا وردە وردە بەهێزتر بوو تاكو گەیشتە هێزی ٩,٣ و ئەمەش دووەمین بەهێزترین بوومەلەرزەیە كە تاكو ئێستا تۆمار كرابێت.



بنكەكانی چاودێری ئەمەیان ئاشكرا كرد كە ئەم بوومەلەرزەیە نزیكەی ماوەی ١٠ دەقیقە بەردەوام بوو. ئەمەش درێژترین ماوەی بوومەلەرزەیە كە بنكەكان لە هەموو ناوچەكانی جیهان تۆماریان كردبێت، بوومەلەرزەكە هێندە بەهێز بوو بەرادەیەك بووە هۆی ئەوەی كە گۆی زەوی بەتەواوی بلەرزێت و دەوروبەری یەك سانتیەتر بەلای كەمی لە شوێنی خۆی لابچێت. ئەم بوومەلەرزەیە هێندە كاریگەر بووە خەڵك لە ناوچەكانی ئێجگار دوور لە سەنتەر هەستییان پێكردووە.

لەگەڵ گەیشتنی ئەم شەپۆلانەی تسۆنامی بۆ قەراغەکانی باشوور و باشووری رۆژهەلات لە کیشوەری ئاسیا بەرزی شەپۆلەکان دەگەیشتە ٣٣ مەتر و شەپۆلە هەرە بەهێزەکانی هەموو شارە قەراغییەکانی رامالی وەکو شارەکانی ولاتانی ئەندەنووسیا و مالیزیا و تایلاند و دورگەکانی مالدیف و سریلانکا و هیندستان و بەنگلادێش سەرەڕای هەندێ دەولەتانی دیکە لە باشووری رۆژهەلاتی ئاسیا کەبەشێوەیەکی کەمتر وێران بوون وەکو میانمار .



هەروەها کاریگەری ئەم شەپۆلانە گەیشتە قەراغەکانی رۆژهەلات و باشووری رۆژهەلاتی کیشوەری ئەفەریقیا . شەپۆلەکان سۆمال و کینیا و تەنزانیا و ولاتی باشووری ئەفەریقیای گرتەوە لە ئاکامی ئەم کارەساتە دەوروبەری ٣٠٠ هەزار کەس کوژرا کە زۆربەیان لە ئەندەنووسیا بوون، سەرەڕای زیانێکی ئێجگار گەورەی ماددیش کە زیاتر لە ٧ ملیار دۆلار دەبوو.

لە کاتی عەسری رۆژی ١٧ی تەمووزی ساڵی ٢٠٠٦ سەر لە نوێ شەپۆڵەکانی تسۆنامی هێرشیان بۆ سەر ئەندەنووسیا برد، بەڵام بەپلەیەکی زۆر کەمتر لە جاری پێشوو. بوومەلەرزەیەکی زەمینەیی لە دووایی ٣٥٠ کیلۆمەتر لە باشووری دوورگەی جاوەی ئەندەنووسیایی رووی دا و بووە هۆی کوشتنی ٦٣٧ کەس لە ناوچە جیاجیاکانی ئەندەنووسیا و ٥٤٣ کەسیش بریندار بوون و ١٦٤ کەسی دیکەش بێ سەروشوێن بوون.



هەروەها ١٦٢٤ خانووی دارماند و زیانی گەورەی لێکەوت. ١٨٧٤ کەشتی تێکشکان و زۆربەیان نغرۆ بوون و لە هەموو ناوچەکانی کە شەپۆڵەکانی تسۆنامی گرتبوونیەوە تەوژمی کارەبای تێدا پچڕا، سەرەڕای پچڕانی هەموو هێڵەکانی تەلەفۆن ... بەرزی شەپۆڵەکانی تسۆنامی ئەمجارەش دەگەیشتە دەوروبەری دوو مەتر ...

لە ١٧ی ئابی ساڵی ١٩٧٦ بوومەلەرزەیەکی توند بەهێزی ٨ پلە لەسەر پێوەری ریختەر لە نێو ئۆقیانووسی هێمنی نزیك فلیپین رووی دا، کاریگەرییەکەی گەیشتە گشت دەوڵەتە نزیك و دەوروبەرەکانی خۆی. لە دوای پێنج دەقیقەی دەستپێکردنی بوومەلەرزەکە شەپۆلەکانی تسۆنامی بەبەرزایی پێنج مەتر شاڵاویان بۆ قەراغەکانی وڵات هێنا و ئەمەش بووە هۆی کوشتنی پتر لە هەشت هەزار کەس و تێکدان و دارماندن و داتەپاندنی گشت ئەو خانووەکانی لە قەراغەکە بوون.



لە ١٧ی تەمووزی ١٩٩٨ بوومەلەرزەیەکی بەهێز لە دووری ٧٠ کم باکووری قەراغی دەولەتی بابیوای غینیای نوێی هەژاندەوە کە دەکەوێتە باکووری ئوستراليا. دوای چەند دەقیقەیەك لە بوومەلەرزەکە شەپۆلەکانی تسۆنامی شاڵاویان بۆ ئەم قەراغە هێنا و، ئەمەش بووە هۆی کوشتنی پتر لە ٣٠٠٠ کەس و، بریندار بوونی سەدانی دیکە و دەربەدەر کردن و ئاوارە کردنی ٦٠٠٠ کەسی دیکەش.

لە ساڵی ١٩٥٢ ئەندەنووسیا تووشی بوومەلەرزەیەکی زۆر بەهێز بووەوە و بووە هۆی روودانی شەپۆلەکانی تسۆنامی و بەرزبوونەوەی ئاستی شەپۆلەکان بۆ پێنج مەتر و کاریگەری شەپۆلەکان گەیشتە چەندین دەوڵەتان کەبەسەر ئۆقیانووسی هێمندا دەڕوانن وەکو ژاپۆن و دورگەکانی هاوای و، هەردوو دەوڵەتی پیرۆ و شیلی لە ئەمەریکای باشوور، ئەمەش لە ئەنجامدا بووە هۆی کوشتنی ٤٠٠٠ کەس و جگە لەمەش زیانێکی ماددی ئێجگار گەورەشی لە خەڵکەکەدا .



یستە مێژووییەکان ژمارەیەکی زۆر لە کارەساتەکانیان تۆمار کردووە کە لە شەپۆلەکانی تسۆنامییەوە روویان داوە و ناوچەی جۆراوجۆریان لە جیهان تووشی کارەساتی دڵتەزێن کردووەتەوە. لەمەشدا قوربانیەکان هەندێ جار لە دەیان کەسەوە تاکو سەدان هەزار کەس بووە. لە لاپەڕەی داهاتوو خشتەیەکە گرنگترین کارەساتە دڵتەزێنەکانی تێدایە وبەرواری رووداوەکانیشی تێدایەکە بەشێوەیەکی زنجیرەیی تۆمار کراون.

| بەروار | شوێن | ژمارەی مردووان |
|---|---|---|
| ١٦٠٥ | ژاپۆن | ٥٠٠٠ |
| ١٦٠٧ | بەریتانیا | ٢٠٠٠ |
| ١٧٠٣ | ژاپۆن | ٥٢٣٣ |
| ١٧٠٧ | ژاپۆن | ٣٠ هەزار |
| ١٧٥٥ | بورتگال و مغرب | ١٠٠ هەزار |
| ١٧٧١ | ژاپۆن | ١٤ هەزار |
| ١٧٨٢ | چین و تایوان | ٤٠ هەزار |
| ١٧٩٢ | ژاپۆن | ١٥ هەزار |
| ١٨٢٦ | ژاپۆن | ٢٧ هەزار |
| ١٨٦٨ | شیلی | ٢٥٦٧٤ |
| ١٨٨٣ | اندونیسیا | ٣٦ هەزار |
| ١٨٩٦ | ژاپۆن | ٢٢ هەزار |
| ١٩٠٨ | ئیتالیا | ٧٠ هەزار |
| ١٩٣٣ | ژاپۆن | ٣٠٠٠ |
| ١٩٥٢ | اندونیسیا | ٤٠٠٠ |
| ١٩٦٠ | شیلی، هاوای، فلیپین، ژاپۆن | ٢٠٠٠ |
| ١٩٧٦ | فلیپین | ٨٠٠٠ |
| ١٩٩٨ | بابیوا نیو غینیا | ٣٠٠٠ |
| ٢٠٠٤ | ئەیندونیسیا، هند، سریلانکا و ئیتر | ٣٠٠ هەزار |
| ٢٠٠٦ | ئەندەنوسیا، جاوە | ٦٣٧ |

## هەڵچوونـــە گڕكانییەكـــان

گڕگان لە ئەنجامی قلیشانەوە لە رووی زەوی یا تویكڵەكەی پەیدا دەبێت. كە دەبێتــە هــۆی دەرپەڕینی بەردە تواوەكان و خۆڵەمێش و گازەكان لە قووڵایی نێوان ٨٠ – ١٠٠ كم لە ژێر قلیشانەوەكە و بەردە تواوەكە و بەردەپۆڵووەكان بەتێپەربوونی رۆژگار شاخ یا شێوەی نیمچە شاخی گڕكانی پێكدێنێت یا بۆ یەكەمین جار لە نێو دەریا دورگەی نوێ بەدیار دەكەوێت .



ئەگەر گڕكانێك لە شوێنێكی نزیك شارەكان یا دێیەكان بتەقێتەوە هەمیشە زیاتی گیـانی و ماددی دەبێت و ئەم زیانانەش هەڵبەتــە بــەگوێرەی دوور و نزیكــی شــارو گونــدەكان لــە سەنتەری تەقینەوەكە كەم و زیادی تێدەكەوێت، هــەروەها تەقینــەوەی گڕكــان لــە هەنــدێ شوێندا ئاگری گەورەی لێدەكەوێتەوە و ئەویش وەكو بوومەلەرزەكان زیانی گەورە لــە گیــان و ماڵی خەڵك دەدەن.

لەگەڵ هەموو شێوەکانی تەقینەوە گڕکانییەکان گازەکان لەگەڵیدا دەردەپەڕن، ئەم گازانە کە لە ژێر زەویدا هەن، لە ژێر کاریگەری پاڵەپەستۆیەکی بەهێز هەوڵدەدەن درزێك بدۆزنەوە دەرچوونی لە هەر درزێك تەقینەوەی گەورە پەیدا دەکات زۆر جاریش ئەم گازانە لە ئەنجامی تێپەربوونی بەردەتوواوەکان بەنێو ئاودا پەیدا دەبن و دەبنە هەڵم لەوانەشە ئەم گازانە لەگەڵ دووەم ئۆکسیدی کاربۆن و دووەم ئۆکسیدی کبریت تێکەڵاو بووبنەوە .



لەوانەیە تەقینەوە گڕکانییەکان ماددەی شل دەربکەن کە لە ماددە تواوەکانی ژێر زەوی یەوە پەیدا دەبێت، یا هەندێ ماددەی نیمچە ڕەق دەردەکات کە لە ماددە دەرپەڕیوەکانی دی گەرمی کەمترە، سەرەڕای ئەمانەش گڕکانەکان بەر لەوەی دەست بە تەقینەوە بکەن یا ماددە تواوەکان دەست بە هەڵچوون بکەن ئەو شوێنەی کە دەبێتە سەنتەری تەقینەوەکە دەقلیشێتەوە و ناوچەی شوێن زارەکی تەقینەوەکە بەردی گەورە گەورەی لێدەردەپەڕێت .

گڕکانی فیزۆف لە گڕکانە هەرە بەناوبانگەکانی مێژووە و دەکەوێتە باشووری ئیتالیا، نزیك شاری ناپۆلی سەر کنار، ئەمەش بە تاکە گڕکانی چالاك دادەنرێت لە ئەورووپا کە تاکو ئیمرۆ مابێتەوە . یەکەمین تەقینەوەی لە ٢٤ ی ئابی ساڵی ٧٩ی زایینی رووی دا و، لە دوای چەند دەقیقەیەکی کەم شاری بۆمیی و، هەردوو شارە نزیکەکانی خۆی، خۆڵەمێش و قوڕ و لیتاوی تواوە دایانی پۆشی و تێیدا دەوروبەری ٤٠٠٠ کەس کوژران .



لە ساڵی ١٦٣١ گڕکانی فیزۆف بۆ جارێکی دی هەڵچوو و پتر لە ٣٠٠٠ کەسی لە نێو برد. ئینجا سەر لە نوێ لە ساڵی ١٧٩٤ تەقییەوە و شارێکی لە باشووری خۆی کاوڵ و وێران کرد و، لە نیسانی ١٩٠٦ بۆ ماوەی دە رۆژ هەڵچوو و بووە هۆی کوشتنی ٢٠٠٠ کەس و، لە ساڵانی ١٩١٣، ١٩٢٦، ١٩٢٩، ١٩٤٤، دیسان دەتەقییەوە بەڵام زیانی زۆر نەبوو.

لە حوزەیرانی ساڵی ١٧٨٣ شاخی لاکی لە بەرزاییەکانی باشووری دورگەی ئایسلەندە کە کەوتووەتە باکووری ئۆقیانووسی ئەتلەسی بە درزێکی بە درێژایی ٢٥ کم لێپەیدا بوو و دەستپێکرد شلکاوی ئاگرینی تەواوەی بەردو ماددەکانی دەردا و هێندەی نەبرد هەڵچوونێکی ئاگرینی ئێجگار گەورە ناوچەکەی داگرت، ئەم هەڵچوونە گڕکانییە ماوەی دوو مانگی بەردەوام درێژەی کێشا و بەگەورەترین هەڵچوونی گڕکانی دەژمێردرێت کە مێژوو تۆماری کردبێت.



هەروەها گڕکانی لاکی گازێکی ئێجگار زۆری دەردا کە لە دووەم ئۆکسیدی کبریت و ئەوانی دی پێکهاتبوو . ئینجا ئەم گازانە لەسەر دورگەکە خەست بوونەوە لە وەرگاکەی پیس کرد و بووە هۆی زیانێکی گەورە کە ٧٥٪ی رانە مەڕەکانی ئەوێی لە نێو برد و لە ماوەی تەقینەوەکە، لافاوە ئاگرینەکە ١٠ هەزار کەس کوژرا کە چارێگی دانیشتوانی ئەو کاتەی دورگەکەیان پێکدەهێنا .

ئەندەنووسیا لە ماوەی مێژووی نوێی خۆی تووشی ژمارەیەکی زۆر لە هەڵچووە گڕکانییەکان بووەتەوە . هەرەگەورەیان گڕکانی تمبوورا بوو کە لە ۱۰ی نیسانی ساڵی ۱۸۱٥ تەقییەوە و ئەمەش بە توندترین هەڵچووە گڕکانییەکان دەژمێردرێت لە جیهاندا، گڕکانەکە قوڕ و لیتاوی ئاگرین و گازاتێکی زۆری دەردا و یەکسەر ۱۰ هەزار کەسی کوشت و هەروەها ناوچەکانی دەوروبەری خۆی بەگشتی بەخۆڵەمێش داپۆشی و ۹۲ هەزار کەس لە برسییەتی و نەخۆشیدا مردن .



ئەو گازانەی کە لێی دەرچوون بڕێکی زۆر لە دووەم ئۆکسیدی کبریتیان تێدا بوو ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە ئەم گازانە لەگەڵ هەڵمی ئاو لە بەرزایی ئاسمان یەکبگرن چینە ترشییەك پێکبێنێت کە هێندە چڕ بوو بەڕادەیەك بەری تیشکی خۆری گرت لە سەرتاپای ناوچەکانی جیهان پلەی گەرمی دابەزاند و ساردییەك داهات بەروبوومەکانی بەجارێك بەست و ئەوەی بەرهەم بوو نەیهێشت، ئەوەی شایانی باسە ناوچەی ئەندەنووسیا و ناوچەکانی دیکەی دەروبەری سارد هەڵگەڕان و ساردییەکەش بەدرێژایی ماوەی هاوین درێژەی کێشا .

لە ٢٧ی ئابی ساڵی ١٨٨٣ ئەندەنووسیا سەر لە نوێ تووشی هەڵچوونێکی گرکانی توند بووەوە کە گڕکانێك لە دورگەی کراکاتا تەقییەوە و بووە هۆی دروستبوونی شەپۆلەکانی تسۆنامی و بەرزییەکەی کە دەگەیشتە قەراغەکان ٣٠ مەتر بلند دەبوو . هەروەها شارەکانی کەوتبوونە قەراغەکانی هەردوو دورگەی جاوە و سۆمەترەشی گرتەوە و شەپۆلەکانی تسۆنامی خەڵکی بەتوندی بۆ نێو دەریا راکێشا و لە ئەنجامدا پتر لە ٣٤ هەزار کەس نغرۆ بوون .



سەرەڕای ئەمە خۆڵێکی ئێجگار زۆر باری و شەپۆلێکی گەرمی دەستپێکرد ماوەی پتر لە ٤٠ کیلۆمەتری سەر رووی دەریا بلاوبووەوە و ئەو پشکۆیانەی لەگەڵ خۆڵبارانەکە دەبارین پتر لە ١٠٠٠ کەسی سووتاند و ئەم تەقینەوە گڕکانییەش بووە هۆی دابەزینی قەوارەی راستی دورگەکە و لە شوێنی گڕکانەکەش زارکێکی گڕکانی گەورەی پڕ لە ئاوی دەریا دروستبوو .

لە ٨ی ئایای ساڵی ١٩٠٢ چیای بیلیە کە کەوتووەتە دورگەی مارتینیك لە دەریای کاریبی رۆژئاوای ئۆقیانووسی ئەتلەسی دەستیپێکرد زنجیرە تەقینەوەیەك هەڵچوو کە لە سەرەتا تارادەیەك سووك بوو، بەڵام شەپۆلی یەك لە دوای یەکی لە پشکۆیە گڕکانییە گەرمەکانی دەهاوێشت، ئینجا شەپۆلی پشکۆ ئاگرەکان پتر بە یەك لادا هات و زۆر بەخێرایی بەشێوەیەکی راستەوخۆ بەرەو سانت بیری پایتەخت دەچوو .



لە ماوەی چەند دەقیقەیەکی کەم پشکۆیە گڕکانییەکان سەرتاپای ئەم شارەیان داپۆشی و ژمارەی دانیشتوانەکەی کە دەوروبەری ٣٠ هەزار کەس دەبوو هەموویان سووتان تەنیا یەك کەس نەبێت کە توانی خۆی رزگار بکات، ئەگەر چی هەڵچوونی گڕکانەکە هێندە گەورە نەبوو بەڵام لەبەر ئەوەی لە ناوچەیەکی پڕ دانیشتوان بوو و لە ماوەی چەند دەقیقەیەکیش هەڵچوو بۆیە بە گەورەترین کارەساتە گڕکانییە دڵتەزێنەکان دادەنرێت .

لە ١٣ی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٨٥ شاخێکی گڕکانیی دامرکاو لە چیایەکانی ئەندیزی کۆلۆمبیای باکووری رۆژهەلاتی ئەمەریکای باشوور دەستی بە چالاکی کرد، ئەو گڕکانەش سەری بە بەفر داپۆشرابوو سەرەڕای ئەوەی تەقینەوە گڕکانییەکە سووك بوو کەچی بووە هۆی دەرپەڕینی ئاگر و بەردو تاوێری گەرم بە نێو بەفرو سەهۆڵبەندەکان لە ئەنجامدا بەفرو سەهۆڵەکان خێرا توانەوە و لێشاوی ئاو پەیدا بوو و لافاو هەڵسا.



ئاوی لافاو تێکەڵاو بە پشکویە گڕکانییەکان بووەوە و قوڕ و لیتاوی ترشی پێکهێنا و دۆڵ و دەشتەکانی گرتەوە و لە نیوەشەو کاتی خەڵك بەگشتی لە خەودا بوون ئەم قوڕ و لیتاوە ترشە گەیشتە شاری ئەرمیرۆ و نزیکەی ٢٣ هەزار کەسی کوشت، لە راستیدا زانایانی گڕکانەکان دەسەڵاتدارانیان لە نزیکبوونەوەی تەقینەوەی گڕکان ئاگادار کردبووەوە و دەکرا ئەگەر زوو شارەکە چۆل بکرایە ئەم کارەساتە رووی نەدەدا .

لە ١٨ ی ئایاری ساڵی ١٩٨٠ ویلایەتی واشنتۆنی ئەمەریکی لە ئەنجامی دارمانی رووی باکوور لە شاخی سانت هیڵین هەڵچوونە گڕکانییەك رووی داو بووەی هۆی هەڵتەکاندن و پەڕینی لووتکەکەی، لە ئەنجامی ئەمەش ئەو ئاگرەی لە ناوەوە کۆببووەوە دەرپەڕی و ستووندێکی ئێجگار گەورە و ئەستووری لە گاز و خۆڵ پێکهێنا کە بەرزاییەکەی گەیشتە ١٩ کم و خۆڵەمێشەکەیشی رووبەرێکی گەورەی گرتەوە لە میشدا شاری بۆرتلاند .



گڕکانی سانت هیڵین لەوەتەی ساڵی ١٨٥٧ — ەوە هێمن و دامرکاو بووە لە راستیدا ئەم تەقینەوە گڕکانییە دانیشتوان و دەسەڵاتدارانی پتر هۆشیار کردەوە کە لە رۆژانی داهاتوو پتر ئاگاداربن و رێنماییەکانی خۆپارێزی پتر رەچاو بکەن لە لاپەڕەی داهاتوودا خشتەیەك هەیە گرنگترین کارەساتەکانی گڕکانی تێدایە .

| بەروار | شوێن | ژمارەی مردووان |
|---|---|---|
| ٧٩ | ڤیزوف، ئیمپراتۆریەتی رۆمانی | ٤٠٠٠ |
| ١٥٨٦ | ئەندەنوسیا | ١٠ هەزار |
| ١٦٣١ | ڤیزوف، ئیتالیا | ٣٠٠٠ |
| ١٧٨٣ | ئایسلەندە | ١٠ هەزار |
| ١٧٩٢ | ژاپۆن | ١٥ هەزار |
| ١٨١٥ | ئەندەنوسیا | ١٠٠ هەزار |
| ١٨٢٢ | ئەندەنوسیا | ٤٠٠٠ |
| ١٨٨٣ | ئەندەنوسیا | ٣٦ هەزار |
| ١٨٨٧ | ئیکوادۆر | ١٠٠٠ |
| ١٩٠٢ | دورگەی مارتنیك، دەریای کاریبی | ٣٠ هەزار |
| ١٩٠٢ | گواتیمالا | ٦٠٠٠ |
| ١٩٠٢ | سانت فنسنت، دورگەی هیندی | ١٦٨٠ |
| ١٩١٢ | ئەندەنوسیا | ٥١١٥ |
| ١٩٥٣ | نیوزیلەندە | ١٥٢ |
| ١٩٨٠ | ئەمەریکا | ٥٧ |
| ١٩٨٢ | مەکسیك | ٣٥٠٠ |
| ١٩٨٥ | کۆلۆمبیا | ٢٣ هەزار |
| ١٩٩١ | فلیپین | ٧٠٠ |
| ٢٠٠٢ | کۆنگۆ | ٢٤٥ |

## لافاو و ئاوهەڵسانەکان

کاتێ باران دەبارێت، یا بەفر دەکەوێت، زەوی هەندێك دەمژێت و، رووەکەکانیش هەندێك بەکاردێنن و هەندێکی دیکەش دەبێتە هەڵم . بەڵام ئەوەی دەمێنێتەوە بە نێو رووبار و جۆگەکاندا دەڕوات و ئیدی ئەگەر ئاوەکە زۆر بەکار نەهێندرێت لافاو هەڵدەستێت و کاتێ لەگەڵ ئەم سات و وەختەش بەفر خێرا دەتوێتەوە ئیتر لە دەورووبەری خۆی ئاو هەڵدەستێت و ناوچەکە دەخاتە ژێر ئاوەوە .



ئینجا ئەم جۆرە لافاوانە لە ناوچەی ناوەوەییەکان روو دەدەن بەڵام لە ناوچە قەراغییەکان گرنگترین هۆیەکانی لافاو ئەوەیە کە ئاوی دەریا بەشێوەیەکی نائاسایی رادەکشێت، یا بەهۆی گێژەلووکەیەکی توند لە دەریاوە هەڵسێت، یا لە ئەنجامی بوومەلەرزەیەك لە ژێرەوەی دەریاوە رووبدات و شەپۆلەکانی تسۆنامی لێبکەوێتەوە وەکو ئەو شەپۆڵە ئاوانەی کە نزیکەی ٣٠ مەتر بەرز دەبنەوە زیانی گەورە لە ماڵ و گیانی دانیشتوان دەدەن .

لە دێر زەمانەوە چەندین هۆ بۆ دەستبەرسەرداگرتنی لافاوەكـان بـەكارهاتووە و هەوڵـدراوە كە مەترسییەكانی لەسەر خەڵك و شار و كێڵگەكان كەم بكرێتەوە .
ئەم هۆیانەش ئەوەیە كە دووبارە دارستانەكان بروێندرێنەوە و، بەنـداوی لـە سـەر شـێوازی كۆن و پێشكەوتوو لەسەر دروست بكرێت و، چاڵی گـەورە بـۆ كۆكردنـەوەی ئـاو دروسـت بكرێت و، جۆگـەی دەسـتكرد دروسـت بكرێـت بـۆ گـۆڕینی ڕێـڕەوی ئـاوی لافاوەكـان و، دوورخستنەوەی شوێنە نیشتەنی و زەوییـە كـشتوكاڵییەكان لـە مەترسـی لافاوەكـان دوور بخاتەوە .



چینییەكان لە دروستكردنی بەنداو و نەهێشتنی كاریگەری لافاوە كاولكەرەكان بـەكۆنترین نەتەوە دادەنرێن، هەزاران ساڵ پێشتر بەنـداویان لەسـەر ڕووبـاری زەرد دروسـت كـردووە و وایانزانیوە كە ڕووبارەكە بەم شێوەیە ڕێڕەوەكەی قووڵ دەبێـت و ئـاوی زیـادە پـتر دەگرێـت، كەچی ئەمە بووە هۆی ئەوەی ژێرەوەی ڕووبارەكە بە قوڕ و لیتاوە نیشتووەكە بـەرز ببێتـەوە كە بوونی بەنداوەكە نەیهێشتووە قوڕو لیتاوەكە بەرێڕەوی ڕووبارەكە بڕوات و دابەش ببێت.

ولاتی چین لە ماوەی مێژووی نوێی خۆیدا تووشی زنجیرەیەك لە لافاوەكان بووەتەوە و لە نێوان سەدەیەك لە رۆژگار نزیكەی ١٠ لافاوی هەردوو رووباری زەرد و رووباری یانگستی بینیوە و تێیدا پتر لە ٣ ملیۆن كەسی كوشتووە . لە سالّی ١٨٨٧ یش ناخۆشترین لافاو لە مێژوودا رووی دا كاتێ رووباری زەرد بەنداوە دروستكراوەكانی كە بۆ بەربەستكردنی ئاوی زیادە دروستكرابوون هەمووی رووخاند و پتر لە ملیۆن كەسی كوشت .



بەلّام هەندێ كەس رووداوەكە وا باس دەكەن كە ٤ ملیۆن كەس قوربانی بووە و هەندێ كەسی دیكەش دەلّێن قوربانییەكان پتر لە ٦ ملیۆن كەس بووە . تاكو ئێستاش هیچ سەرچاوەیەك ژمارەی راستی قوربانییەكانی بە چنگ نەكەوتووە تاكو وەكو سەرچاوەیەك پشتی پێ ببەستێت، گرنگترین هۆی ئەم كوژراوە زۆرەش ئەوەبوو كە زەوییە بەربلاّوەكانی دەوروبەری رووباری زەرد لە ئاستی رووی زەوی نزمتر بوونە و لافاوەكەش زۆر بە خێرایی ناوچەكانی پڕ ئاو كردووە.

لە ساڵی ١٩٣١ ئاوی رووباری زەرد سەر لە نوێ هەڵساو بووە هۆی لە نێو بردن و بزر کردنی یەك ملیۆن کەس، بە قسەی هەندێ کەسیش کوژراوەکان ٤ ملیۆن کەس دەبوون و نزیکەی ٨٠ ملیۆن کەسی دیکەشی ئاوارە و دەربەدەر کرد . هۆی مردنی ئەم ژمارەیە زۆرەش لە ئەنجامی نغرۆبوونی خەڵك و بڵاوبوونەوەی نەخۆشی و نەهێشتن و تێکدانی بەروبوومە کشتوکاڵییەکان بوو ئینجا لە دوای ئەمانەش برسییەتی و قاتوقڕی پەیدا بوو و خەلکە زۆربەی بەبرسییەتی مردن، هەندێ کەسیش وا دەگێڕنەوە کە ئەم دوو ژمارەیەی سەرەوە هەندێ زیادەی تێکراوە دوا بە دوای ئەم لافاوە کە هێشتا کاریگەرییەکەی مابوو



لە ساڵی ١٩٣٣ لافاوێکی دیکەی رووباری زەرد رووی دا بەڵام کاریگەرییەکەی لەوەی پێشتر کەمتر بوو، سەرەرای ئەوەی ئەم لافاوە زۆر بەخێرایی لە ناوچەکانی دەوروبەری خۆی بڵاوبووەوە کەچی وەکو ئەوەی پێشوو زیانی نەبوو و لەگەڵ ئەمەشدا ژمارەی کوژراوانی ئەم لافاوە گەیشتە ١٨ هەزار کەس، لەوانەشە هۆی ئەم کەم زیانە ئەوە بێت کە لافاوەکە لە شوێنێکی پڕ دانیشتوان نەبووە .

لە ساڵی ١٩٣٨ و ماوەی دووەمین جەنگی جیهانی کە لە نێوان چین و ژاپۆندا رووی دا، ئەو کاتە ژاپۆنییەکان بەشێکی ئێجگار گەورە لە ناوچەکانی کەوتووەنەتە باکووری رۆژهەڵاتی چین داگیر کردبوو و پتر لە ١٠٠ هەزار مەدەنی و سەربازی کوشت و لە شاڵاوبردنی خۆی هێشتا بەردەوام بوو بۆ ئەوەی خاکی چین پتر داگیر بکات . لەو کاتە سەرکردایەتی چین بریاری دا بەنداوی سەر رووباری زەرد برمێنێت بۆ ئەوەی رێگە لە شاڵاوەکانی هێزی ژاپۆنی بگرێت .



لە بەیانی ٩ی حوزەیرانی هەمان ساڵ ئاوی لافاو بەشێوەیەکی زۆر ترسناك دەوروبەر و ناوچەکەی بەگشتی پڕ ئاو کرد و ٥٤ هەزار کیلۆمەتری چوار گۆشەیی خستە ژێر ئاو و لە ئەنجامدا نێوان ٥٠٠ هەزار و ٩٠٠ هەزار کەسی کوشت و بزر کرد . ئەم ژمارەیەش لە دوو سەرچاوە وەرگیراوە و لە ئەنجامدا رووباری زەرد رێڕەوی گۆڕاو کەوتەوە سەر رێڕەوێکی کۆنی خۆی کە لە رێڕەوەکەی خۆی بەرەو باشوور دەبووەوە.

بەڵام رووباری یانگستی ئەویش لە ماوەی سەدەی بیستەم بووەتە هۆی سێ کارەساتی سەرەکی . یەکەمینیان لە ئەیلوولی ساڵی ١٩١١ کاتێ ئاوەکەی هەڵساو دەریاچەیەکی دروستکرد رووبەرەکەی گەیشتە پتر لە ٧٠٠٠ کیلۆمەتری چاورگۆشەیی و، نزیکەی ١٠٠ هەزار کەسی کوشت و لە ئابی ساڵی ١٩٥٤ سەر لە نوێ ئاوەکەی زیادی کرد بووە هۆی کوشتنی دەورووبەری ٤٠ هەزار کەس و دەربەدەرکردن و ئاوارە کردنەوەی ١٠ ملیۆن کەسی دیکەش.



لە هاوینی ساڵی ١٩٩٨ وڵاتی چین لە هەندێ بەشەکانی رووباری یانگستی تووشی لافاو بووەو بووە هۆی کوشتنی دەورووبەری ٣٠ هەزار کەس و ١٤ ملیۆن کەسی دیکەش دەربەدەر بوون ناچار بوون ماڵەکانی خۆیان بەجێ بهێڵن و، ئەو زیانە ماددییەی لە خانوو و بەروبوومە کشتوکاڵییەکان کە لە ئەنجامی ئەم لافاوە رووی دا گەیشتە پتر لە ٢٤ ملیار دۆلار.

لە مانگی ئابی ساڵی ۱۹۷٥ بارانێکی ئێجگار زۆر بەشێوەیەکی رەچاو نەکراو لە هـەرێمی هینان باری کە دەکەوێتە ناوەراستی وڵاتی چین . لە ماوەی چەند رۆژێکی کەمدا ۲٦ بەنـدا و لە قەوارەی گەورە و بچووك لە ئەنجامی پاڵەپەسـتۆی هەڵـسانی ئـاوێکی زۆر بەسـەریدا رووخان، کە هەڵسانی ئاوەکە لە توانای گلدانەوەی بەنداوەکانـدا زۆر پـتر بـوو و ناوچـەیەك بەدرێژایی ۱٥۰ کیلۆمەتر و بەرینایی ۷٥ کیلۆمەتر کردە دەریاچەیەکی ئێجگار زەبەلاح.



ئیتر لە ئەنجامی ئەم دارووخانە پتر لە ٤ ملیۆن کەس بە ئاو گـەمارۆ درا و دەوروبـەری ۸٥ هەزار کەس کوژراو خنکا، سەرەرای ١٤٥ هەزار کەسـی دیکـەش بـە نەخۆشـی و پـەتا و برسییەتی کە لە دوای کارەساتەکە پەیدا بوو مردن . هەروەها نزیکەی ٦ ملیـۆن خـانووی هەڵتەکاند و ۱۱ ملیۆن خانووی دیکەش چۆڵکرا.

لە مانگی ئابیساڵی ١٩٧١ ڤێتنامی باکوور بەر لەوەی لەگەڵ ڤێتنامی باشوور ساڵی ١٩٧٦ یەکبگرێتەوە و کۆماری ڤێتنامی سۆشیالیست پێکبێنێت تووشی لافاوێکی گەورە بووەوە . لافاوەکە لە ئەنجامی بارنبارینێکی بە خوڕەم پەیدا بوو ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە ئاستی ئاوی رووبارەکان بەرز ببێتەوە ، ئیتر لافاوەکە بووە مایەی کوشتنی ١٠٠ هەزار کەس و تێکچوون و رووخانی هەزاران خانووش کە بەشێکی زۆر لەمانە لە دار دروستکرابوون.



ئەوروپاش لە ساڵی ١٩٥٣ بەشی خۆی لە کارەساتەکانی لافاو بینی کاتێ گێژەلووکەیەکی توند لە سەر دەریای باکوور هەڵسا و لەگەڵ خۆیدا هەڵکشانی ئاوی دەریای بەرز کردەوە و ، دەوروبەری ٢٥٠٠ کەسی لە هۆڵەندا و ئینگلتەرا و ئەوانی دیکەی وڵاتەکانی ئەوروپا کوشت و هەروەها بووە هۆی نغرۆ بوونی کەشتییەکی گەورەی نەفەر هەڵگر لە نێو دەریا ، کە ١٣٣ کەسی هەڵگرتبوو و هەمووشیان مردن.

بەنگلادیش لەم وڵاتانە دەژمێردرێت کە زۆر تووشی لافاو دەبنەوە بەهۆی نزمی بەشێکی زۆر لە خاکەکەی چونکە دەکەوێتە سەر دەشتایی رووباری گانج کە ئەم دەشتاییەش لە هەموو دەشتەکانی جیهان پتر تووشی لافاو دەبێتەوە و چونکە دەکەوێتە ناوچەیەك زۆر گێژەلووکە و گەردەلوولی بەهێز دەیگرێتەوە کە بەشێوەیەکی بەردەوام لە ئۆقیانووسی هیندییەوە هەڵدەکات.



لە توندترین و گەورەترین لافاوەکان کە تووشی ئەم وڵاتە بووەتەوە ئەوەیە کە ساڵی ١٨٧٦ رووی دا کاتێ دەوروبەری ٨ هەزار کیلۆمەتر چوارگۆشەیی ئاوی لافاو داپۆشی و، ١٠٠ هەزار کەسی کوشت و هەروەها ١٠٠ هەزار کەسی دیکەش بە هۆی نەخۆشییەکان کە دوای لافاوەکە بڵاوبوونەوە مردن . لە هەردوو ساڵی ١٩٧٤ و ١٩٨٨ لافاوەکان بە هەزاران کەسیان لەم وڵاتە هەژار و برسییە کوشتووە و بەسەدان هەزار کەسی دیکەشیان لە ماڵەکانی خۆیان دەربەدەر و ئاوارە کردووە.

لە ساڵی ١٩٥٤ لافاوێکی گەورە لە وڵاتی ئێران رووی دا پتر لە ١٠ هەزار کەسی کوشت، لە ساڵی ١٩٧٧ وڵاتی هیندستان تووشی گێژەڵووکەیەك بووەوە و لە دوای ئەویش ئاو هەڵسا نێوان ٧ هەزار تا ١٠ هەزار کەسی کوشت و، لە ساڵی ١٩٧٩ لافاوێکی دیکە لە هیندستان رووی دا بەگوێرەی هەندێ مەزندەکان دوو هەزار کەسی کوشت و سەرچاوەی دیکە کوژراوەکانی بە ٥ هەزار کەس مەزندە کرد و، هەندێ سەرچاوەی دیکەش ژمارەکەیان بە ١٢ هەزار کەس مەزندە کرد .



لە ساڵی ٢٠٠٤ هەردوو کۆماری هاییتی و دۆمینیکان کە یەك دورگە دابەش دەکەن و کەوتوونەتە رۆژئاوای ئۆقیانووسی ئەتلەسی تووشی لافاوێکی بەهارەیی گەورە بوونەوە، لافاوەکە بووە هۆی کوشتنی ژمارەیەکی زۆر لە خەڵك و، هەندێ سەرچاوە ژمارەی کوژراوەکانیان بە ١٦٠٠ کەس مەزندە کرد، کەچی لە هەندێ سەرچاوەی دی کوژراوەکانی بە ٣٣٦٠ کەس دیارکردبوو .

سەرچاوە مێژووییەکان باس لەوە دەکەن کە لە سوریا شاری حەلەب کە کەوتووەتە باکووری سووریا لە ٦ی شوباتی ساڵی ١٩٢٢ تووشی لافاوێکی گەورە بووەتەوە چەندین ناوچە و لەمانەش وێستگەی شەمەندەفەر لە حەلەب کە پێی دەگوترێت وێستگەی بەغدا ژێر ئاوی لافاو کەوتووە . بەڵام سەرچاوەکان نە ژمارەی قوربانییەکان یا قەوارەی زیانەکان ئاشکرا ناکەن کە لە ئەنجامی لافاوەکەوە رووی دا . هەروەها سەرچاوەکان باس لەو هۆیانەش ناکەن کەلافاوەکە لەبەرچی رووی داوە .



وڵاتی فلیپین لەو وڵاتانە دەژمێردرێت کە تووشی چەند جۆرە کارەساتە سروشتییەکان دەبێتەوە وەکو گڕکان و بوومەلەرزە و لافاوەکان . ساڵی ٢٠٠٦ دوواترین لافاو ١٨٠٠ کەسی لە دانیشتوانەکەی کوشتووە .

لە لاپەڕەی داهاتوو خشتەیەك هەیە تێیدا بەناوبانگترین لافاوەکانی دیاریکردووە کە لە جیهاندا روویانداوە .

| بەروار | شوێن | ژمارەی مردووان |
| --- | --- | --- |
| ١٨٧٦ | بنگلادیش | ٢٠٠ هەزار |
| ١٨٨٧ | چین، روباری زەرد | ملیون ٤ / ٦ |
| ١٨٨٩ | بینسلفانیا | ٢٢٠٠ |
| ١٩١١ | چین، رووباری یانگستی | ١٠٠ هەزار |
| ١٩٣١ | چین، رووباری زەرد | ملیون ٤ |
| ١٩٣٣ | چین، رووباری زەرد | ١٨ هەزار |
| ١٩٣٥ | چین، رووباری یانگستی | ١٤٥ هەزار |
| ١٩٣٨ | چین، رووباری زەرد | ٥٠٠ / ٩٠٠ هەزار |
| ١٩٥٣ | هۆلەندە، بەریتانیا، و ئیتر | ٢٥٠٠ |
| ١٩٥٤ | چین، رووباری یانگستی | ٤٠ هەزار |
| ١٩٥٤ | ئیران | ١٠ هەزار |
| ١٩٦٣ | ئیتالیا | ١٩٠٠ |
| ١٩٧١ | ڤیتنامی باکوور | ١٠٠ هەزار |
| ١٩٧٥ | چین، دارمانی بەنداو | ٢٣٠ هەزار |
| ١٩٧٩ | هیندستان | ١٢/٥٠٠٠/٢٠٠٠ |
| ١٩٩٨ | چین، رووباری یانگستی | ٣٠٠٠ |
| ٢٠٠٤ | هایتی و کۆماری دومینیکان | ٣٣٦٠ / ١٦٠٠ |
| ٢٠٠٥ | هیندستان | ١٠٠٠ |
| ٢٠٠٦ | فلیپین | ١٨٠٠ |

# گێژەڵووکەکـــــان

ناوی گێژەڵووك بەم گەردەلوولە توندە دەگوترێت کـە لەسـەر دەریـا و ئۆقیانووسـەکان لـە ناوچـە خولگەییـەکان یـا نیمـچە خولگەییـەکان پەیـدا دەبێـت بەتایبـەتی لـە هـەردوو ئۆقیانووسـی هـێمن و ئەتلەسـی . گێژەلووکـە لـە بایـەکی تونـد و بـەهێز پێکـدێت و بەشێوەیەکی بازنەیی بەدەوری سەنتەرێکی پاڵەپەستۆی نزم هەڵـدەکات و پێـی دەگوترێـت چاوی گێژەڵووك و، هەر چەند لە چاوی گێژەڵووك نزیك ببیتەوە توندییەکەی پتر دەبێت .



لەوانەیە تیرەی ئەو ناوچـەیەی بایـە کاولکـەرەکان دەیگرێتـەوە بگاتـە ٢٤٠ کیلۆمـەتر و هەندێ جاریش دەگاتە ٤٨٠ کیلۆمەتر گێژەڵووکەکان ٥ پلەیان هەیە، خێرایی با تێیدا لـە پلە ١ کە سووکترینە دەگاتە ١٢٠ کیلۆمـەتر لـە یـەك کاتـژمێر کەچـی لـە پلـە ٥ کـە توندترینە لە یەك کاتژمێر دەگاتە ٢٥٠ کیلۆمەتر.

تیکرای تیرەی چاوی گێژەڵووکە دەگاتە دەوروبەری ٢٤ کیلۆمەتر و لەوانەشە لە گێژەڵووکە توندەکان لە ١٦ کیلۆمەتریش کەمتر بێت و لە گێژەڵووکە سووکەکان لە ٤٨ کیلۆمەتر پتر بێت و هەرچەند تیرەی چاوی گێژەڵووکە کەمتر بێت توندی گێژەڵووکەکە و هێز و توانای بایەکە توندتر بێت و کاتێ با دەگاتە نێو چاوی گێژەڵووك بە تەواوی لە جوولە دەوەستێت و هەورەکان پەرت دەبن و ئاسمان دەبێتە ساماڵ، بەڵام شەپۆلی دەریا هێشتا بەتوندی دەمینێتەوە.



گێژەڵووك ستوونێکی گەورە لە هەوا پێکدێنێت، کە لە نێو هەورەکانەوە درێژ دەبێتەوە و دەگاتە ئاستی رووی زەوی، ئەم ستوونە زۆر بە توندی بە دەوری خۆیدا سوور دەخوات و کاتێ گێژەڵووك دەگاتە پلەیەکی بەرز لە هێزو توندی دەکرێ رووەك لە رەگ و ریشەوە هەڵتەکێنێت، خانووی تەواو برووخێنێت و ئۆتۆمبێل و پاسەکان هەڵبدات و تاکو فارگۆنەکانی هێڵی ئاسنیش بەسەریەکیاندا بدات و وەریانبگێرێت.

باشووری رۆژهەڵاتی ولاتە یەكگرتووەكانی ئەمەریكا لەو ناوچانە دادەنرێت كە گێژەڵووكەكان زۆر هێرشی بۆ دەكەن و، لە ئابی ساڵی ١٩٠٠ شاری گالفستۆنی ئەمەریكایی كە كەوتووەتە سەر دورگەیەك لە كەنداوی مەكسیك تووشی گێژەڵووكەیەك بووەوە و لە ئەنجامدا دەوروبەری ٨ هەزار كەس كوژرا . دوای ئەمە دەسەڵاتدارەكان بەنداوێكی بەربەستیان بەدرێژایی ١٦ كم بەدرێژایی قەراغە دەریاییەكە دامەزراندن تاكو لە دوا رۆژدا ئەم شارە لە مەترسی باو ئاو هەڵسان بپارێزێت .



لە ١٨ی ئەیلوولی ساڵی ١٩٠٦ گێژەڵووكەیەكی توند بەبێ ئاگاداری پێشتر یا پێشبینی لە روانگە ئاسمانییەكان دورگەی هۆنگ كۆنگی گرتەوە. لێرەدا هیچ ژمارەیەكی راست و دروست بۆ ژمارەی قوربانییەكان نییە، بەڵام هەندێ سەرچاوە بە ( ١٠ ) هەزار و ( ١٥ ) هەزار كەس مەزندەی كوژراوەكان دەكەن و، هەڵبەتە ئەمەش لە كاتی خۆیدا لە سەدا ٥ی ژمارەی دانیشتوانی هۆنگ كۆنگ بووە.

کەنداوی بەنگال بەشێکی ئاوی ئۆقیانووسی هیندییە و وەکو لقێك لە ئۆقیانووس درێژ بووەتەوە و قەراغی هەردوو وڵاتی هیندستان و بەنگلادیشی گرتووەتەخۆ . هەروەها ئەم کەنداوە دەکەوێتە نێو ناوچەی خولگەیی . بە بارانی بە خوڕەم و گێژەڵووکەکانی بەناوبانگە کە لە مانگی ئایارەوە تاکو تشرینی یەکەم درێژە دەکێشێت کە کارەساتی زۆر دڵتەزێن دەنێتەوە و، لە ساڵی ١٩٤٢ گێژەڵووکەیەك کە لە کەنداوی بەنگالەوە هەڵیکرد و ناوچەی تشیتاگۆنگی هیندستانی ئەو کاتی گرتەوە کە ئێستا سەر بە بەنگلادیشە و پتر لە ٤٠ هەزار کەسی کوشت .



لە تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٦٠ قەراغی هەمان ناوچە دیسان گێژەڵووکەیەکی توند گرتییەوە کە ئەو کاتی سەر بە بەشی رۆژهەڵاتی پاکستان بوو، گێژەڵووکەکە شەپۆلەکانی هەڵکشانی ئاوی بەرز کردەوە و بووە هۆی کوشتنی پتر لە ١٠ هەزار کەس و پتر لە ٩٠٠ هەزار کەسی دیکەشی لەماڵەکانی خۆیان دەربەدەر و ئاوارە بوون.

لە کۆتایی ئایاری ساڵی ١٩٦٣ ناوچەی کەنداوی بەنگال سەر لە نوێ تووشی گێژەڵووکەیەکی بەهێز بووەوە و لە ئەنجامدا دەوروبەری ٢٢ هەزار کەس کوژرا و سەدان هەزار کەسی دیکەش لە ماڵەکانی خۆیان دەربەدەر و پەرگەندە بوون . لە تشرینی یەکەمی هەمان ساڵ ناوچەی دەریای کاریبی رۆژئاوای ئۆقیانووسی ئەتلەسی کە دەکاتە قەراغە باشوورییەکانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا گێژەڵووکەیەکی بەهێز گرتییەوە و ٦ هەزار کەسی کوشت.



لە ١١ ی ئایاری ساڵی ١٩٦٥ ناوچەی کەنداوی بەنگال دیسان گێژەڵووکەیەکی بەهێز لێی دا و دەوروبەری ١٧ هەزار کەسی کوشت و، لە دوای بیست رۆژ لە یەکی حوزەیرانی هەمان ساڵ هەمان ناوچە تووشی گێژەڵووکەیەکی دی بووەوە و بووە هۆی کوشتنی دەوروبەری ٣٠ هەزار کەس و لە ئەنجامی ئەو دوو گێژەڵووکەی دوایی سەدان هەزار کەسی دیکەش دەربەدەر و ماڵوێران بوون .

لە ١٥ی کانوونی یەکەم لە هەمان ساڵی ١٩٦٥ گێژەڵووکەیەکی خولگەیی بۆردومانکەر لە ناوچەی شاری کەراتشی دا کە کەوتووەتە سەر قەراغی دەریای عەرەبی باشووری رۆژهەلاتی پاکستانی رۆژئاوایی و ئەمەش بەر لەوەی پاکستانی رۆژهەلاتی لێی جیا ببێتەوە و ببێتە دەوڵەتی بەنگلادێشی سەربەخۆ، ئیدی لە ئەنجامی ئەم گێژەڵووکە دەوروبەری دە هەزار کەس کوژراو سەدان هەزار کەسی دیکەش لە جێی و رێی خۆیان دەربەدەر و ماڵوێران بوونەوە .



لە بەنگلادێشیش لە ١٣ی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٧٠ گێژەڵووکەیەکی خولگەیی بووە هۆی داتەپینی زەوی، ئەو بەنگلادێشەی ئێستا ئەو کاتە بەشی رۆژهەلاتی لە دەوڵەتی پاکستان پێکدەهێنا و زانایانی روانگە ئاسمانییەکان ئەم گێژەڵووکەیان بەخراپترین کارەساتی سروشتی لە قەڵەم دا کە ئەو ناوچەیە لە سەردەمی نوێ تووشی ببوو.

ئەم گێژەڵووکە شەوی ١٢ی تشرینی دووەم لە کەنداوی بەنگال دەستپێکرد و، ئینجا خەریك دەبوو لە قەراغەکە نزیکدەبووەوە، شەپۆڵی دەریا لەگەڵ بای گەرلوولێك دەهات خێراییەکەی لە یەك کاتژمێردا دەگەیشتە ١٨٥ کم ئیتر شەپۆڵی ئاوی دەریای بۆ ١٢ مەتر بەرز دەرکردەوە و بەمەش لەگەڵ گزنگی بەربەیان ناوچە نشێوە پڕ دانیشتوانەکان لە ژێر ئاودا نغرۆ بوون کە خەڵکەکە هێشتا لە خەوی قووڵدا بوون. راپۆرتە سەرەتاییەکان دیاریان خست کە ٣٠٠ هەزار کەس لە ماوەی ٢٠ دەقیقەی یەکەمدا خنکاون.



لە دوای ئەمە راپۆرتەکان ئەم ژمارەیەیان بۆ ٥٠٠ هەزار کوژراو بەرز کردەوە، لەگەڵ ئەمانەش ١٠٠ هەزار کەسی دیکە لە ژێر قوڕ و لیتاودا گووم بوون خراپترین زیانەکان لە دورگە نشێوەکان کەوت کە کەوتوونەتە سەر دەشتی رووباری گانج لە باشووری شاری داکا و لەوێ دوو شارۆچکە نزیکەی بەتەواوی تێچوون و شاری تشیتاگۆنگیش بەشێکی زۆر گەورەی لەگەڵ زەوی تەخت بوو.

لە ٢٥ی ئایاری ساڵی ١٩٨٥ گێژەڵووکەیەکی بەهێزی نوێ رووی لە بەنگلادیش کرد و قەراغە نزمەکانی ناوچەکانی باشووری گرتەوە و لە گەڵیشیدا شەپۆلە زۆر بەرزەکانی تسۆنامی رووبەرێکی زۆر گەورەی لە وڵات پڕ ئاو کرد و دەوروبەری دە هەزار کەسی لە نێو برد . ئینجا لە شەوی ٢٩ی نیسانی ساڵی ١٩٩٠ گێژەڵووکەکەی خولگەیی تێکدەر دەستپێکرد و هەمان ناوچەی گرتەوە و شاری تشیتاگونگ و دەوروبەریشی گرتەوە .



ئەم گێژەڵووکە لەگەڵ بایەکی توند پێکەوە هەڵیانکرد خێراییەکەی لە ٢٥٠ کم لە یەك کاتژمێر رەتیکرد و ئەمەش بووە هۆی بەرزبوونەوەی ئاستی شەپۆڵەکانی ئاوی دەریا بۆ پتر لە ٦ مەتر و ناوچەیەکی ئێجگار فراوانی خستە ژێر ئاو و دەوروبەری ١٣٨ هەزار کەس کوژران کە زۆربەیان لە ئاوەکەدا خنکان و هەروەها زۆربەشیان ژن و منداڵ و پیرەکان بوون.

دوای گێژەڵووکەی ساڵی ١٩٧٠ سەرەڕای ئەوەی حکومەتی بەنگلادیش چەندین پەناگەی بۆ کاتی ڕوودانی کارەساتەکان دروستکرد کەچی زۆربەی قوربانییەکان ماوەی ئەوەیان نەبوو تاکو بزانن بۆ کوێ بچن و هەندێکی دیکە هەرگیز بەخەیاڵیاندا نەدەهاتەوە کە گێژەلووك هێندە گەورە و بەهێز بێت بەرزایی خانوویەك بخاتە ژێر خۆی، لە ئەنجامدا یەك ملیۆن کەس ماڵەکانی خۆیان بەجێهێشت . هەروەها بنکەیەکی دەریایی و ئاسمانیش تووشی زیانێکی گەورە بوونەوە و زیانە ماددییەکان گەیشتە دەوروبەری ١,٥ ملیار دۆلار .



لە ١٠ ی حوزەیرانی هەمان ساڵی ١٩٩١ گێژەڵووکەیەکی زۆر توند سەر لە نوێ ئەم ناوچەیەی گرتەوە لەگەڵ ئەمیشدا شەپۆڵەکان تەواو بەرز بوونەوە لە ئەنجامدا ئاو هەڵسا و رووبەرێکی فراوانی لە ناوچەکانی دەوروبەری شاری تشیتاگۆنگ لە ئاودا نغرۆ کرد و دەوروبەری یەك ملیۆن خانووی داتەپاند و دەوروبەری ١٢٥ هەزار کەسی کوشت و دە ملیۆن کەسیشی بەبێ دالدە هێشتەوە.

هەروەها وڵاتی هیندستانیش بەشی خۆی لە گێژەڵووكەكاندا هەبووە، كە لە ماوەی سەردەمەكانی كەمێك پێشتر تووشی بووە . لە ۲۹ی ئەیلوولی ۱۹۷۱ ناوچەی ئۆریسای رۆژهەڵات كە دەڕوانێتە سەر دورگەی بەنگال و لە بەنگلادیش نزیكە، تووشی گێژەڵووكەیەك بووەوە و نێوان ۱۰ هەزار و ۲۵ هەزار كەسی كوشت .

لە ۱۹ی تشرینی دووەمی ساڵی ۱۹۷۷ ناوچەی ئەندرا برادش لە باشووری رۆژهەڵاتی هیندستان گێژەڵووكەیەك گرتییەوە و دەوروبەری ۲۰ هەزار كەسی كوشت .



لە بەیانیی ۲۹ی تشرینی یەكەمی ساڵی ۱۹۹۱ ناوچەی ئۆریسای هیندی رۆژهەڵات سەر لە نوێ تووشی گێژەڵووكەیەك بووەوە و لە گەڵیدا بایەكی توند هەڵیكرد خێراییەكەی گەیشتە ۲٥۰ كم لە یەك كاتژمێردا و بارانی بەخوڕەمیش باری و شەپۆڵەكان لە ۷ مەتر بەرزتر بووەوە و دەوروبەری ۱۰ هەزار كەسی كوشت و ٤۰۰ هەزار سەرمەریش ئاو بردی و خنكاندنی و دەوروبەری ۸۰۰ هەزار خانووش ئاوی شەپۆڵە توندەكان لەگەڵ زەوی تەخت بوون .

وڵاتی فلیپپینیش لە ماوەی مێژووی خۆیدا لە گێژەڵووکەکان رزگاری نەبووە کە چەندین جار ئەم وڵاتەشی گرتووەتەوە، لەمانە توندترینیان لە ١٢ی ئایاری ساڵی ١٩٩١ رووی دا ئەویش بووە هۆی کوشتنی دەوروبەری چوار هەزار کەس . بەڵام لە ئەمەریکای ناوەراست کە دەکەوێتە سەر دەریای کاریبی ئەویش لە ٢٩ی تشرینی یەکەم ساڵی ١٩٩٨ گێژەڵووکەیەك گرتییەوە لە ئەنجامدا ١١ هەزار کەسی لەنێو برد ئەویش لە ئەنجامی ئاو هەڵسان و داتەپینی زەوی لە نیکاراگوا و سلفادۆر و هیندۆراس .



بێ گومان لاپەڕەکانی ئەم کتێبە بۆ باسکردنی گشت گێژەڵووکەکان کە لە رۆژگاری دووروودرێژدا وڵاتانی دنیای گرتووەتەوە زۆر کەمە و ناکرێ باسی گشت گێژەڵووکەکان بکەین، چونکە تەنیا لە ماوەی سەدەی رابردوو گێژەڵووکەکان یەك ساڵ بەسەر ناچێت کە بەهەزاران کەس دەکوژێت و هەزاران کەسی دیکەش لە ژێر قوڕولیتاودا دەخنکێنێت و بەهەزاران خانووش دەرووخێنێت .

| بەروار | شوێن | ژمارەی مردووان |
|---|---|---|
| ١٩٠٠ | وولاتە یەکگرتووەکان | ٨ هەزار |
| ١٩٠٦ | هۆنگ کۆنگ | ١٠ – ١٥ هەزار |
| ١٩٤٢ | هیندستان | ٤٠ هەزار |
| ١٩٥٩ | ژاپۆن | ٤٠٠٠ |
| ١٩٦٠ | رۆژهەلاتی پاکستان | ١٠ هەزار |
| ١٩٦٣ | بەنگلادیش | ٢٢ هەزار |
| ١٩٦٣ | دەریای کاریبی | ٦ هەزار |
| ١٩٦٥ | بەنگلادیش | ١٧ هەزار |
| ١٩٦٥ | بەنگلادیش | ٣٠ هەزار |
| ١٩٦٥ | کەراتشی، پاکستان | ١٠ هەزار |
| ١٩٧٠ | بەنگلادیش | ٣٠٠ / ٥٠٠ هەزار |
| ١٩٧١ | هیندستان | ١٠ / ٢٥ هەزار |
| ١٩٧٧ | هیندستان | ٢٠ هەزار |
| ١٩٨٥ | بەنگلادیش | ١٠ هەزار |
| ١٩٩١ | بەنگلادیش | ١٣٨ هەزار |
| ١٩٩١ | فلیپین | ٤٠٠٠ |
| ١٩٩١ | بەنگلادیش | ١٢٥ هەزار |
| ١٩٩٨ | ئەمەریکای ناوەراست | ١١ هەزار |
| ١٩٩٩ | رۆژهەلاتی هیندستان | ١٠ هەزار |

## گەردەلوولە بەفرینەکان

گەردەلوولی بەفرین گەردەلوولی زستانەیی توندە، بەمە ناسراوە کە لەو کاتە پلەکانی گەرما زۆر بە توندی دادەبەزێت و بایەکی بەهێز هەڵدەکات خێراییەکەی لە دەوروبەری ٦٠ کم لە یەك کاتژمێردا دەبێت و بەفرێکی ئەستووریش لەگەڵیدا دەبارێت ئەمە ئەو کاتە روو دەدات کە ناوچەیەکی پاڵەپەستۆ بەرز لەگەڵ ناوچەیەکی پاڵەپەستۆ نزم پێکدەگەن ئەمەش دەبێتە هۆی هەڵکردنی با لە ناوچەی یەکەم بۆ دووەم .



لە کاتی گەردەلوولی بەفرین ماوەی بینین کەم دەبێتەوە بۆ کەمتر لە ٤٠٠ مەتر، لەمەشدا رووداوەکانی هاتوچۆ لە رێگاکانی دەرەوە و ناوەوە زۆر دەبێت و زیانی گیانی و ماددی لێ دەکەوێتەوە، کیشوەری ئەوروپا گەورەترین گەردەلوولی بەفرینی بەخۆیەوە بینی کە لە مێژووی خۆیدا رۆژی ٢٩ی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٥٦ رووی دا و بووە هۆی کوشتنی دەوروبەری دوو هەزار کەس .

لە ٩ ی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٦٣ داڕووخانێکی زەوی لە باکوری ئیتالیا رووی دا و چەندین گوندی نغرۆ کرد و بووە هۆی کوشتنی دەوروبەری ٢٠٠٠ کەس، لە ١١ ی ئابی ١٩٧٩ لە وڵاتی هیندستان بارانی بە تەوژم بووە هۆی داڕووخانی زەوی و لە ئەنجامدا بەنداوێکی رووخاند و بووە هۆی نغرۆ بوونی چەندین گوند و کوشتنی ٢٠٠٠ تا ٥٠٠٠ کەس، لە هەندێ راپۆرتیشدا هاتووە کە ژمارەی قوربانییەکان لە ١٢ هەزار کەس زیاتر بووە.



لە تەمووزی ساڵی ٢٠٠٥ داڕووخانێکی دیکەی زەوی لە هیندستان تووشی شاری مۆمبای باشووری رۆژئاوای وڵات بوو و ناوچەی مهاراشترا و دەوروبەری گرتەوە و بووە هۆی کوشتنی دەوروبەری هەزار کەس و، لە ساڵی ٢٠٠٦ داڕمانێکی گەورە لە دورگەی لیتی کە دەکەوێتە باشووری رۆژهەڵاتی فلیپین رووی دا و بووە هۆی ئەوەی پتر لە ١٨٠٠ کەس بکوژێت.

## داڕووخانی زەوی

داڕووخان یا دارمانی زەوی ئەوەیە کە تۆپەڵێك لە بەردو خۆڵەکان لە لێژی شاخێك خلۆر ببێتەوە . دەکرێ ئەمە رووبدات کاتێ زەوی ئاوی باران و بەفرە تواوەکان لە لێژییەکە دەمژێت و کون و کەلین و شوێنە قلیشاوەکان تێر ئاو دەخۆن ئینجا دەگاتە چینێك لە بەردە تەڕە لووسەکان و ئیتر دەستپێدەکەن لە لێژییەکە بەرەو خوارەوە دەخزن و لەسەر رووی ئەم چینە ئاو دەوەستێت .



ئەگەر چینەکە زۆر لووس بێت، ئەوا تۆپەڵەی گەورە لە بەردەکان لەبەر لێژی شوێنەکەی خۆی جێ شوێنی خۆی لەق دەبێت و بەرەو خوارەوە دەخزێت و دەکرێ خزینی تۆپەڵە بەرد و خۆڵەکان بەشێوەیەکی هێمن بێت و هیچ زیانێکی لێ نەکەوێتەوە . داڕووخانی زەوی هەندێ جاریش بەهۆی بوومەلەرزە و گڕکانەوە روو دەدات و ئەم شێوە داڕووخانانەش کاتێ لە شوێنی نیشتەجێی خەڵکدا دەبێت زیانی گیانی و ماددی زۆری لێدەکەوێتەوە .

لە ٩ ی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٦٣ داڕووخانێکی زەوی لە باکوری ئیتالیا رووی دا و چەندین گوندی نغرۆ کرد و بووە هۆی کوشتنی دەوروبەری ٢٠٠٠ کەس، لە ١١ ی ئابی ١٩٧٩ لە وڵاتی هیندستان بارانی بە تەوژم بووە هۆی داڕووخانی زەوی و لە ئەنجامدا بەنداوێکی رووخاند و بووە هۆی نغرۆ بوونی چەندین گوند و کوشتنی ٢٠٠٠ تا ٥٠٠٠ کەس، لە هەندێ راپۆرتیشدا هاتووە کە ژمارەی قوربانییەکان لە ١٢ هەزار کەس زیاتر بووە.



لە تەمووزی ساڵی ٢٠٠٥ داڕووخانێکی دیکەی زەوی لە هیندستان تووشی شاری مۆمبای باشووری رۆژئاوای وڵات بوو و ناوچەی مهاراشترا و دەوروبەری گرتەوە و بووە هۆی کوشتنی دەوروبەری هەزار کەس و، لە ساڵی ٢٠٠٦ داڕمانێکی گەورە لە دورگەی لیتی کە دەکەوێتە باشووری رۆژهەڵاتی فلیپین رووی دا و بووە هۆی ئەوەی پتر لە ١٨٠٠ کەس بکوژێت.

# رنییە بەفرین

رنییە بەفرین کەوتنی لە ناکاوی تۆپەڵەیەکی گەورەی لە بەفرە یا شەختەیە لە لێژی شاخێکدا و خێراییەکەی هەندێ جار ١٦٠ کم لە یەك کاتژمێردا پتر دەبێت ئەم رنییە بەفرینە هەندێ جار لە غلۆر بوونەوەدا تۆپەڵەیەکی ئێجگار گەورە پەیدا دەکات و زیانی گەورە لە گیان ماڵی دەدات، رنییەکەش لەگەڵ لەرزینەوەیەکی توندی زەوی و دەنگی گەورەی دارووخانەکان پەیدا دەبێت .



دانکە بەفرینە خڕەکان پتر تووشی دارووخان دەبنەوە نەك وردە بەفری نەرمی ئاسایی، زۆر جاریش رنییە بەفرین لە زۆر بارینی بەفر روو دەدات کە لە ناکاو و لەسەریەك چەند رۆژ دەبارێت بێ ئەوەی بەفرە کۆنەکە ماوەی هەبێت لەگەڵ بەفرە نوێیە کەوتووەکە یەکدی بگرێت و ببێتە پارچەیەك لە سەهۆڵ . یا هەندێ جاری دیکەش لەوە روو دەدات کە بەفرە نوێیەکە دەست بە توانەوە دەکات و لەسەر بەفرە کۆنەکە جۆگەلە ئاو هەڵدەبەستێت .

لە کۆتایی شوباتی ساڵی ١٩٩٩ لە هەندێ وڵاتانی ئەوروپا وەکو نەمسا و فەرەنسا و سویسرا و ئیتالیا بەفر دەستی بە بارین کرد و ماوەی چەند ڕۆژێك لێی نەکردەوە و بەشێوەیە نا ئاسایی بەفرێکی ئەستوور کەوت و لە ئەنجامدا بەدەیان کەسی کوشت و بەسەدان کەسی دیکە کە لە خلیسکانێ بوون بریندار کرد و چەند خانووی لەگەڵ خۆی ڕاماڵی و خەڵکەکانیشی لە ژێر تۆنەها بەفر بزر کرد .



لە ٢٩ ی ٣٠ ی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٧٠ وڵاتی ئێران تووشی زنجیرەیەك لە ڕنبیە بەفرینەکان بووەوە کە بەدەیان کەسی کوشت و سەدانیشی بریندار کرد ، لە زستانی ساڵی ١٩٨٦ دەیان سەربازی نەرویجی کەلیبیانیان لە پێدا بوو لە کاتی پاسەوانیدا بوون لە ئەنجامی ڕنبیە بەفرینێك کوژران کە تۆپەڵە بەفرێکی هێندەی شاخێك بەسەریاندا ڕما و کەوتنە ژێرییەوە .

## ئاگرە گەورەکان

لەوانەیە لە هەر شوێنێکدا سووتەمەنی و ئۆکسجین هەبێت کە هەردووکیان بۆ هەڵگیرسان و بەردەوامبوونی ئاگر زۆر پێویستن ئاگرە گەورەکانی لێبکەوێتەوە و، ئەم دوو بابەتەش لە زۆر شوێندا هەن، وەکو باڵەخانە نیشتەنییەکان و باڵەخانەی نووسینگەکان و هۆیە جۆراوجۆرەکانی گواستنەوە، هەروەها ئەم دوو بابەتە لە دارستانەکانیشدا زۆرن و لە زەوییە کشتوکاڵییەکانیشدا هەن کە پووشی چەند ساڵەی تێدا کۆبووەتەوە .



لە هۆیە گرنگەکانی هەڵگیرسانی ئاگرە گەورەکان پشتگوێخستنی هەندێ کەسە کە چاودێری ڕێنماییەکانی چوونە نێو دارستانەکان ناکەن وەکو فڕێدانی قنگە جگەرەکان کە هێشتا ئاگریان پێوە ماوە و یا بۆری ستووندی کارەبا بەنێو دارستانەکاندا دەچەقێنن و یا ئەوەتا لە هەندێ ماڵەکانی نێو دارستانەکان کابانی ماڵەوە ئاگاداری بۆری گازی نێو ماڵ نابێت و گازی لێدەچێت، یا ئەوەتا لە ئەنجامی بروسکیش ئاگرە گەورەکان پەیدا دەبن .

راپۆرتەكانی كۆمەڵەی نیشتمانی ئەمەریكایی بۆ پارێزی لە ئاگرەكان ئەوەی ئاشكرا كرد كە لە وڵاتە یەكگرتووەكانی ئەمەریكا لە ماوەی هەر ٦١ چركە لە نێو باڵەخانەیەك یا دامودەزگەیەك ئاگرێك هەڵدەگیرسێت و، سێ چارێكی ئەم ئاگردانەش لە باڵەخانە تایبەتمەندییەكانی بۆ نیشتەجێبوەكان هەڵدەگیرسێت، ئەمانەش لە ئەنجامی پابەند نەبوونی ئەندامانی خێزان بەرێنموماییەكانی پارێزی لە ئاگرەكان و یا یاریكردنی منداڵان بە ئاگردانە گازییەكان، یا ئاگر كردنەوەی منداڵان بەمەبەستی یاریكردن.



لەم راپۆرتانەدا هاتووە كە دەوروبەری دوو ملیۆن ئاگرساڵی ١٩٩٨ لە سەرانسەری وڵاتە یەكگرتووەكانی ئەمەریكا هەڵگیرساوە و، ئەمەش بووەتە هۆی مردنی ٤٠٠٠ كەس، هەندێك لەمانە پیاوانی ئاگر كوژێنەوە بوونە و لە كاتی كوژاندنەوەی ئاگری ئەم ئاگرە گەورانە كوژراون و، ٢٣ هەزار كەسیش تووشی برینی جۆراوجۆر بوونەتەوە و، هەروەها زیانی ماددی زۆر گەورەشی لێكەوتووەتەوە كە لە ٩ ملیار دۆلار رەتی داوە .

کاتی بەرپابوونی ئاگرە گەورەکان لە دارستانەکان، فڕۆکەکانی تیپە ئاگر کوژێنەوەکان بە ماددە کیمیاییەکان لە ئاسمانەوە ئاگرەکان کیمیا رشێن دەکەن تاکو نەهێڵن ئۆکسجین بگاتە درەخت و رووەکە ئاگر تێبەربووەکان هەروەها ئۆتۆمبێلەکانی ئاگر کوژێنەوەش ئاو دەرژێننە سەر ئاگرەکان، ئەمانە و لە لایەکی دیکەوەش هەموو شێوە رووەك و درەختەکانی دەوروبەری ئاگرەکەش دەبڕنەوە و لایان دەدەن و ئەمانە و چەندین شێوازی دیکەش بۆ کوژانەوەی ئاگرە گەورەکان بەکار دەهێندرێن .



گرنگترین ئاگرە گەورەکان کە لە ساڵە کەمەکانی رابردوو روویان داوە کە دەوروبەری دوو ملیۆن هیکتار لە دارستانی لە نێو برد ئەوە بوو کە لە هەردوو دوورگەی بۆرنیۆ و سۆمەترەی ئەندەنووسیایی ساڵی ١٩٧٧ رووی دا دووکەڵێکی رەشی ئەستوور ئاسمانی گشت دەوڵەتانی دەوروبەری گرتەوە، بووە هۆی بڵاوبوونەوەی نەخۆشی و، هەروەها بووە هۆی کەوتنی فڕۆکەیەکی نەفەرهەڵگر و کوشتنی هەموو ئەوانەی لە نێویدا بوون .

لە ساڵی ١٩٩٨ ئاگرێكی ئێجگار گەورە ملیۆنەها هیكتاری لە دارستانەكانی مەكسیك لە نێو برد . ئەم ئاگرانە لە كانوونی یەكەمی ساڵی ١٩٩٧ دەستیان پێكرد و بەهاتنی نیسانی ساڵی ١٩٩٨ پتر پەرەی سەند تاكو بووە كارەساتێكی ناوچەیی و، ئینجا لە حوزەیران بەهاتنی كژی زستان ئاگرەكان وردە وردە دامركانەوە و زۆر لەم ئاگرانەش لەوە روو دەدەن كە خاوەن مەڕو ماڵاتەكان شوێنی دارستانەكان دەسووتێنن بۆ ئەوەی بۆ ئاژەڵەكانیان ببێتە لەوەرگا .



هەندێ جاریش ئاگرەكان لەوە پەیدا دەبن كاتێ بوومەلەرزەی توند لە ناوچەیەك دەدات و یەكسەر ئاگری لێدەكەوێتەوە، وەكو ئەوەی لە شاری سان فرانسیسكۆی ئەمەریكایی رووی دا كە لە دوای بوومەلەرزەی ساڵی ١٩٠٦ سێ رۆژ بوومەلەرزەكە بەردەوام بوو و شارەكە ئاگری تێبەربوو . هەروەها ئەو دوو ئاگرەی كە لە ژاپۆن روویان دا لە ئەنجامی بوومەلەرزە ساڵی ١٩٢٣ و ساڵی ١٩٩٥ بووە هۆی ئەوەی ژمارەی قوربانیان زۆر بێت .

## شەپۆڵەکانی گەرمی

دەکرێ شەپۆڵەکانی گەرمی بەوە پێناسە بکرێت کە ماوەی چەند ساتێکی دوور و درێژ گەرمی بەشێوەیەکی نائاسایی بەرز دەبێتەوە و لەگەڵ ئەویشدا شێی کەشوهەواش بەرز دەبێتەوە . ئینجا بۆ ئەوەی بەرزبوونەوەی گەرمی بە ( شەپۆڵی گەرمی ) لە قەڵەم بدەین پێویستە ئەم بەرزبوونەوەیە رۆژێکی تەواو بەلای کەمەوە درێژە بکێشێت چونکە شەپۆڵەکانی گەرمی زۆرجار لە چەند رۆژێکەوە بۆ چەند هەفتە درێژە دەکێشێت .



شەپۆڵەکانی گەرمی چەندین مردنی لێدەکەوێتەوە و، بەتایبەتی لە نێوان بەنێوساڵدا چووان و منداڵان، لە نوێترین شەپۆڵەکانی گەرمی و توندترینیان ئەوە بوو کە لە هاوینی ساڵی ٢٠٠٣ ئەورووپای گرتەوە کە پلەکانی گەرما دەوروبەری دە پلە لە رێژەی ئاسایی خۆی ئەم ماوەیەی ساڵ بەرزتر بووەوە و لە ئەنجامدا دەوروبەری ٥٠ هەزار کەس مردن .

وڵاتی ئیتالیا لە هەموو وڵاتە ئەوروپییەکانی دیکە پتر کەوتە ژێر کاریگەری ئەم شەپۆڵە گەرمییە، بەرادەیەك پلەی گەرمی لە ٤٠ پلەی سەدی تێپەڕی کرد و دەوروبەری ٢٠ هەزار کەس مردن و لە فەرەنساش لە هاویندا پلەی گەرمی مام ناوەنجی بوو و دەوروبەری ١٥ هەزار کەس مردن و، ژمارەی مردووەکانیش لە ئینگلتەرا گەیشتە ٢ هەزار کەس . لە هەریەك لە وڵاتانی سویسرا و ئەڵمانیا و ئیسپانیا و پورتگالیش مردووەکان بەرێژەیەکی زۆر کەم بوون .




هەروەها ئەم شەپۆڵە گەرمە بووە هۆی ئەوەی بەفرەکانی شاخە بەرزەکانی ئەلپ بەشێوەیەکی نا ئاسایی بتوێنەوە و بەمەش ئاستی ئاو لە دەریاچە و رووبارەکان بەخێرایی بەرز بووەوە و هەڕەشەی مەترسییەکی گەورەی دەکردەوە، هەروەها بەرهەمی کشتوکاڵی لەم وڵاتانە بەگوێرەی ساڵانی پێشتر بەتایبەتی گەنم و ترێ بۆ ١٢ تا ٢٠ لە سەدا دابەزی .

## برسییەتییەکان

برسییەتی تەنگژەیەکی کۆمەڵایەتی و ئابوورییە بەشێوەیەکی گشتی پێکەوەیە لەگەڵ بڵاوبوونەوەی کەمی خۆراك و نەخۆشی کە دەبێتە هۆی بەرزبوونەوەی ژمارەی مردووەکان . سەرەڕای ئەوەی کە برسییەتی هەر کات لەگەڵ کەمی ماددە خۆراکییەکان پەیدا دەبێت، هەروەها لەگەڵ خراپی بەڕێوەبردنی ئابووری وڵاتیش پەیدا دەبێچت و لە ماوەکانی جەنگیش پەیدا دەبێت بەتایبەتی ئەگەر جەنگەکە درێژخایەن بێت، سەرەڕای ئەمانەش برسییەتی لەو ساڵانەش پەیدا دەبێت کە باران کەم دەبێت و بەرهەمی کشتوکاڵی قاتوقڕی تێدەکەوێت .



لە ماوەی سەدەی بیستەم دەوروبەری ٧٠ ملیۆن کەس لە هەموو جیهاندا بە برسییەتی مردوون، لە هەردوو کیشوەری ئاسیا و ئەفەریقیا، لەوانە دەوروبەری ٣٠ ملیۆن کەس تەنیا لە وڵاتی چین لە ماوەی برسییەتییەکەی کە لە نێوان هەردوو ساڵانی ١٩٥٨ و ١٩٦١ دا رووی دا مردوون ئەویش لە دوای بارانێکی زۆر و ئاوهەڵسان و لافاو بەدیارکەوت کە بەروبوومی کشتوکاڵی بەجارێك لە نێوبرد و وشکییەکی بەدوادا هێشتەوە.

لە ساڵی ١٩٤٣ برسییەتییەك لە ناوچەی بەنگالی سەر بە هیندستانی ئەو کاتە رووی دا و هەر لەوکاتەی خۆراك کەمبووەوە و نەخۆشییەکان بەدوایدا بڵاوبوونەوە پتر لە سەری ٣ ملیۆن کەسی تێچوواند و، لە نێوان شەستەکان و هەشتاکان لە سەدەی بیستەم برسییەتی لە کیشوەری ئەفەریقیا میلۆنەها کەسی کوشتووە و بەتایبەتی لە مۆریتانیا و مالی و تشاد و نایجەر و بۆرکینافاسۆ و هەر لەو ماوەیەش لەم کیشوەرە ٥٠ ملیۆن کەس لە بێ خواردن و کەمی خۆراك دەیانناڵاند .





لە ساڵی ٢٠٠٥ دەوڵەتی مەلاوی لە ئەفەریقیا تووشی قات و قڕییەکی خۆراك بووەوە و دەورووبەری ٥ ملیۆن کەس لەبەر کەمی خۆراك کەوتنە بەر هەڕەشەی مردن ئەمەش لە ئەنجامی ساڵەوشکی کە بەرادەیەکی زۆر ئاستی بەرهەمی کشتوکاڵی کەم کردەوە، لە ساڵی ٢٠٠٦یش دەوڵەتی نایجەر تووشی تەنگژەیەکی خۆراك بووەوە ئەویش لە دوای وشکەساڵی پەیدا بوو و بووە هۆی ئەوەی بەرهەمی کشتوکاڵی زۆر دابەزێت .

## پەتاکـــــــان

دەکرێ پێناسەی پەتاکان بکەین کە بڵاوبوونەوەیەکی نائاسایی نەخۆشییەکی درمییە لە ناوچەیەکی بەفراوان لە جیهان یا لە نێوان ژمارەیەکی زۆر لە خەڵك . لەوانەیە پەتا ماوەکەی کورت بێت و لەوانەشە چەند ساڵ درێژە بکێشێت روودانیشی لە ئەنجامی بڵاوبوونەوەی میکروب و ڤایرۆسەکان دەبێت کە لە رێگەی ئاو و خواردەمەنییە پیسەکان دەگوێزرێتەوە، یا لە رێگەی بەیەکگەیشتنی راستەوخۆ لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی دی .



زەردەواڵە و کرتێنەرەکان، وەکو مشك و جرجەکان و هەندێ ئاژەڵەکانی دیکە بەهۆیە سەرەکییەکان دادەنرێن لە بڵاوبوونەوەی ژمارەیەك لە دەردو نەخۆشییەکان لە نێو کۆمەڵگەی مرۆڤایەتیدا لەوانەیە بکرێ رێگە لە بڵاوبوونەوەی دەردەکان بگیریت یا گەمارۆی نەخۆشییەکە بدرێت لە ناوچەیەکی بچووك چوارچێوەی بگیرێت هەڵبەتە ئەمەش بەوە دەکرێت کە لە ئاوو خواردەمەنی پیس دوو بکرێتەوە، گرنگی بەتەندروستی بدرێت و لەو کەسانەش دوور بکەوینەوە کە تووشی یەکێك لە نەخۆشییە درمییەکان بوونەتەوە .

لەساڵی ١٩٨١ – ەوە تاکو ئێستا نەخۆشی ئایدز یا کەمبوونی بەربەستی وەرگرتە لە جیهان بڵاوبووەتەوە، ئەویش نەخۆشییەکی ڤایرۆسییە بەهۆی پێوەندی گومانلێکراوی سێکسییەوە، یا بەهۆی دەرزی خاوێننەکراو تووشی مرۆڤ دەبێت تێیدا ئامرازی بەرگری سروشتی لە لەش تێکدەدات و دەگاتە ئەنجامی مردن، راپۆرتەکانی رێکخراوی تەندروستی جیهانی ئاماژە بەوە دەکەن کە ٤٠ ملیۆن کەس لە جیهاندا تووشەوەبووی نەخۆشی ئایدزن. لەمانەش تاکو ئێستا پتر لە ٢٥ ملیۆن کەس مردوون .



لە ساڵی ١٩٥٧ دەردی ئەنفلەوەنزای ئاسیایی لە چین بەدیار کەوت، لە ماوەی شەش مانگ لە هەموو جیهان بڵاوبووەوە و بووە هۆی مردنی دەوروبەری ٤ ملیۆن کەس، لە ساڵی ٢٠٠٣ دەردی ئەنفلەوەنزای باڵندە بڵاوبووەوە کە نەخۆشییەکی ڤایرۆسییە و تووشی هەندێ لە باڵندەکان دەبێت و ڤایرۆسەکەش لە رێگەی دەستلێدان یا خواردنی باڵندەکە بۆ مرۆڤ دەگوێزرێتەوە، ئەم نەخۆشییە تاکو ئێستا بووەتە هۆی مردنی سەدان کەس .

## نغرۆ بوونی تایتانیك

نغرۆ بوونی کەشتی نەفەرهەلگری تایتانیك بە خراپترین کارەساتە دەریاییەکان لە مێژوو دادەنرێت . ئەم کەشتییە نازدارە کە درێژی دەگەیشتە ٢٦٩ مەتر و کێشەکەی ٤٦ هەزار تەن دەبوو لە یەکەمین گەشتدا بوو لە ئینگلتەراوە بۆ ئەمەریکا کاتێ بەشاخێکی سەهۆڵبەند دەکەوێت رووداوەکەش رۆژی ١٤ی نیسانی ساڵی ١٩١٢ دەبێت لە کاتژمێری ١١,٤٠ی پێش نیوەشەو .



لە کاتی دروستکردنی گەورەترین کەشتی نەفەر هەلگری ئەو سەردەمەی خۆی دەبێت و خاوەنەکەی کەشتییەکەی خۆی وا دامەزراند کە هەرگیز نغرۆ نابێتەوە لەبەر ئەوەی ژووری دەرگا داخراوی تێدابوو کە ئەمە بەس بوو بۆ ئەوەی لە کاتی نغرۆ بووندا بتوانێت کەشتییەکە لەسەر ئاو بهێڵێتەوە، لە یەکەمین گەشتیدا کە دوایەمین گەشت بوو تایتانیك ٢٢١٨ کەسی هەلگرتبوو کە دەستەی کرێکار و ئەندازیار و کەشتییەوانەکانیشی تێدا بوو و لەمانە ١٥٠٦ کەس خنکان و ٧١٢ کەسیش رزگار بوون.

## سێگۆشەی بەرمۆدا

ئەمە ناوچەیەکە لە شێوەی سێگۆشەیەك دەکەوێتە رۆژئاوای ئۆقیانووسی ئەتلەسی، سەرە باکوورییەکەی لە دورگەی بەرمۆدایە و، رۆژئاواییەکەی لە نیمچە دورگەی فلۆریدای ئەمەریکاییە و، باشوورییەکەشی لە دورگەی پۆرتۆریکۆیەوەیە . سێگۆشەی بەرمۆدا کە هەمیشە بەناوی سێگۆشەی نەگریس ناسراوە، رووداوەکانی ئەم ناوچەیە چەندین چیرۆکی شێواوی لێکەوتووەتەوە کە هەندێ کەشتی و فڕۆکەکانی تێدا گووم بووە .



ئیدی یەکەمین رووداو کە ناوبانگە بەدەکەی سێگۆشەی بەرمۆدای ئاشکرا کرد، ئەوەبوو پۆلێك کە لە پێنج فڕۆکەی مەشقی ئەمەریکایی پێکهاتبوو و ١٤ کەسی هەڵگرتبوو لە کانوونی یەکەمی ١٩٤٥ بزر بوون و لە دوای ئەویش زنجیرەیەك لە هێمای دەنگی بەهاناهاتنیان بۆ رەوانەکرا و ئینجا فڕۆکەیەکی وشکاوی رەوانەکرا تاکو بەدوای پۆلە گوومبووەکەدا بگەڕێت بەڵام ئەویش بزربوو و هیچ زانیارییەکی لێنەزانرا .

لە دوای ئەم رووداوە لە ناوچەکە چەندین فرۆکە و کەشتی گوومبوون، لەمانە فرۆکەیەکی نەفەرهەلگر ٣٢ کەسی هەلگرتبوو لە سالی ١٩٤٨ بزربوو و فرۆکەیەکی دیکەی نەفەرهەلگر ٥٣ کەسی هەلگرتبوو و لە سالی ١٩٥١ بزربوو و فرۆکەیەکی دیکەی نەفەرهەلگر ٢٧ کەسی هەلگرتبوو و لە سالی ١٩٨٤ بزربوو و کەشتی نەوتبەر کە ٣٩ کەسی لەسەر بوو سالی ١٩٦٣ بزربوو و ژیراوێکی ئەمەریکیی کە بە وزەی ئەتۆم کاری دەکرد سالی ١٩٦٨ گوومبوو و هەرگیز شوێنەواری نەدۆزرایەوە .




هەندێ شیکەرەوەکان پاساو بۆ هۆی ئەم رووداوانە دێننەوە کە لە ئەنجامی هەلەی هونەری نێو فرۆکە یا کەشتییەکان بووە، یا لەبەر کەمی شارەزایی فرۆکەوان یا کەشتییەوانەکان بووە، یا کەشوهەوا خراپ بووە و پێش خۆیان کەم بینیوە، یا لەبەر نەمانی لە ناکاوی سووتەمەنی بووە، هەروەها شیکەرەوەکان ئەمە دوپات دەکەنەوە کە ژمارەی ئەم رووداوانە ئاسایی بووە و لەوانەیە لە هەر ناوچەیەکی دیکە بووایە ئەمانە روویان دەدا .

